حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# بابەتە کۆمەلایەتییەکان

## پۆلی هەشتەمی بنەڕەتی

**دانانی**

**مێژوو**

د. قادر محەممەد پشدەری    د. عبدالحکیم ئەحمەد مام بکر
د. مەهدی قادر خضر    میقداد حوسێن تەها

**جوگرافیا**

د. سلێمان عبداللە ئیسماعیل    د. سۆزان مۆفەق عبدالعزیز
حکمت عبدالعزیز حمد    هیشام محەممەد حمد

**هاونیشتمانی بوون**

خورشید عزالدین معروف    یوسف عوسمان حمد

**پێداچوونەوەی زانستی بەشی جوگرافیا**

پ. د. ئازاد نەقشبەندی

**پێداچوونەوەی زانستی بەشی مێژوو**

د. قادر محەممەد پشدەری    د. عبدالحکیم ئەحمەد مام بکر

چاپی دوانزەهەم    ١٤٣٧ کۆچی – ٢٧١٦ کوردی – ٢٠١٦ زایینی

پێداچوونەوەو بژارکردن و سەرپەرشتی زانستی:
عبید خضر فتح الله
سەرپەرشتی هونەری چاپ: عثمان پیرداود
خالد سلیم محمود
نەخشەسازی ناوەوە: رابەر عبدالواحید محمد
جێبەجێکردنی بژاری هونەری: شیماء یاسین اکرم



نەخشەی(٤٣)
بەرزی ونزمی رووی زەوی جیهان
0 700 1400 2100 2800
Kilometers
0 1105 2210 3315
Miles
زیاتر لە
5000 4000 3000 2000 1000 500 200 0 200 2000 5000 5000
زیاتر لە
زەریای مەنـــــگ ( هێمن )
زەریای ئەتڵەســــی
زەریـــــای هیندی
ئەمریکای باکور
ئەمریکای باشور
ئەفریقـــــا
ئەنتـــارکتیــــکا
گرینلاند
کەنداوی مەکسیک
دەریای کاریبی
40 N
23.3N
20N
0
20 S
23.3 S
40 S
60 S
66.3 S
60 N

## جیهان و دابەش بوونی کیشوەرەکان:

ڕووی زەوی لە وشکانی و ئاو پێکهاتوە، بەشە وشکانیەکان پێیان دەوترێ کیشوەرەکان کە بە چەند دیاردەیەك لە یەکتری جودا دەکرێنەوە بۆ نمونە: (دەریای سورو نۆکەندی سوێس) کیشوەری ئاسیا لە کیشوەری ئەفریقیا جودا دەکاتەوە.

وە زنجیرە چیاکانی (ئۆڕاڵ) ئاسیا لە ئەورووپا جودا دەکاتەوە، وە زەریای هێمن ئاسیا لە ئەمەریکا جودا دەکاتەوە.

### کیشوەرەکان ئەمانەن:

١- ئاسیا

٢- ئەورووپا

٣- ئەفریقیا

٤- ئەمەریکای باکوور

٥- ئەمەریکای باشوور

٦- ئوستڕالیا

٧- کیشوەری بەستەڵەکی باشوور (ئەنتارپکتا)

# بەندی یەکەم

# ئاسیا

نەخشەی (٣٠)
بەرزی ونزمی رووی زەوی کیشوەری ئاسیا

0 690 1380 2070 2760
Kilometers

0 1090 2180 3270
Miles

نەخشەی روی زەوی ئاسیا

## پێشەکی:

ئاسیا کیشووەری هەرە گەورەیە لە نێوان کیشوەرەکانی زەوی، رووبەرەکەی نزیکەی٤٤ ملیۆن کیلۆمەتری دووجایە.

ئاسیا لە باکوورەوە لەگەڵ زەریای بەستەڵەك سنووردارە و تەنگەبەری بێرنگ و زەریای هێمن دەکەوێتە رۆژهەڵاتەوە، لە باشوورەوە زەریای هیندی لە گەڵی سنووردارە و لە باشووری رۆژئاواوەش هەردوو دەریای سوور و ناوەڕاست هەن، لە رۆژئاواوەش سنووری هاوبەشی نێوان هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەورووپا پێکدێت لە زنجیرەشاخەکانی ئۆرال و کوردستان دەکەوێتە کیشوەری ئاسیا.

## بەرزی و نزمیی کیشوەری ئاسیا :

پێکهاتەی سەر ڕووی زەوی ئاسیا بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلێن دەکرێ.

### أ- دەشتەکان:

دەشتەکانی ئاسیا ڕووبەرێکی زیاتر پێکدەهێنن لە کۆی گشتی زەویەکانی ئەم کیشوەرە، بەشی زۆری رۆژئاواو باکووری رۆژئاوایی رووسیای ئاسیایی لە دەشت پێکدێت، لە دەشتە گەورەکانی تر دەشتی هەردوو رووباری دیجلە و فوراتن لە باشووری رۆژئاوای ئاسیادا، هەروەها ئەو دەشتی ڕووباری گانج لە باکووری هندەو، دەشتی ڕووباری میکۆنگ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، دیسان دەشتی رووباری یانگتسی لە چیندا.

## ب. هەرێمی چیاکان:

زنجیرە شاخەکانی ئاسیا گەورەترین ناوچەی شاخاوییەکانی جیهان پێکدێنن، ئەو زنجیرە شاخاویانە بریتین لە:

١- زنجیرەچیای هیمالایا: دەکەوێتە سنووری نێوان هیند و چین (هیند و میانمار) و (چین و پاکستان).

٢- زنجیرەی کەرە کورم زنجیرەی دووەم پێکدێنێت لە ڕووی گرنگیەوە، ئەم زنجیرەیە لوتکەی هەرە بەرزی جیهانی لە خۆ گرتووە وەکو لوتکەی ئەڤرێست.

٣- زنجیرە شاخەکانی (کەنلۆن و تیان شان) بەدرێژایی ١٦٠٠کم بۆ ناو خاکی چینەوە درێژ دەبنەوە.

٤- زنجیرەی (هندو کۆش) کە بەرەو ناوەڕاستی ئەفغانستانەوە درێژ دەبێتەوە، ئەم زنجیرە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە بە باکووری ئێراندا تێپەڕ دەبێت.

٥- زنجیرە چیاکانی سولەیمان: لە گرێی پامیردا بەرەو ڕۆژئاوای پاکستانەوە درێژدەبێتەوەو لە خاکی پاکستان دەچێتە دەرەوەو بەناو خاکی ئێراندا تێدەپەڕێت تا دەگاتە تورکیا. هەروەها زنجیرە چیاکانی زاگرۆس و تۆرۆس کە دەکەونە کوردستان.

### جـ. بانەکان:

چەند بانێك هەن لە نێوان زنجیرە شاخەکاندا لە ئاسیادا بەرزترینیان بانی تیبتە، زۆرجار بە سەربانی جیهان ناوەدەبرێت دەکەوێتە نێوان چیاکانی هیمالایاو کەنلۆنەوە. رووبەرەکەی ١,٣ ملیۆن کیلۆمەتری دووجایە، ئەم بانە بەرزیەکەی لە ٤٣٠٠م زیاترە. لە باشووری رۆژئاوایی ئاسیاش بانەکانی ئەنەدۆلی لە تورکیا و بانی عەرەبی لە ناو عەرەبستانی سەعوودیا و بانی ئێرانی هەن و بانی سیبریا لەباکووری رووسیا دا هەیە.

### د- گرنگترین رووبار و دەریاچەکانی ئاسیا:

### ١- رووبارەکان:

ژمارەیەکی زۆر لە رووبار لە کیشوەری ئاسیادا هەیە کە لە ناوچە بەرزەکانی کیشوەرەکە هەڵدەقولێن و بەئاراستە جیا جیا کاندا تێدەپەڕن و دەڕژێنە ئەو دەریاو زەریاییانەی کە دەورەی کیشوەرەکەیانداوە، لەم چەند خاڵەی خوارەوە ئاماژە بە گرینگترین رووبارەکانی ئاسیا دەدەین:

١- رۆژهەلاتی ئاسیا شوێنگەی رووبارە هەرە درێژەکانی ئاسیایە، وەك بانگنسی کە درێژەیەکەی ٦٣٠٠کم کە رووە و رۆژهەلات دەڕوات لە ناوچەی تیبتەوە بەرەو دەریای چینی رۆژهەلات دەڕوات.

٢- ڕووبارە سەرەکیەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا لە نێوان زنجیرە چیاکانەوە دەڕۆن وەك ڕووباری میکونگ کە لە تیبتەوە دەردەچێت و دەرژێتەوە دەریای چینی باشوورەوە، هەروەها رووبارەکانی سالوین و ئیراوادی کە دەرژێنە دەریای ئەندامانەوەلە باشووری بۆرما.

٣- سەرچاوەی رووبارە هەرە سەرەکیەکانی باشووری ئاسیا چیاکانی هیمالایایە. وەك هەردوو رووباری گانج و براهما بوترا کە لە نزیك کەنداوی بەنگالەوە بەیەك دەگەن دەڕژینە ئەم کەنداوە.

٤- تاکە ڕووبارە سەرەکیەکانی باشووری رۆژئاوایی ئاسیا دیجلە و فوراتن، هەردووکیان لە باکووری کوردستان هەڵدەقولێن و بە هەرسێ وڵاتی تورکیا و سوریا و عێراقدا تێدەپەڕن لە باشووری عێراقەوە بەیەك دەگەن و رووباری شەتتولعەرەب پێك دەهێنن.

٥- سێ ڕووباری هەرە درێژی رووسیای ئاسیایی رووبارەکانی (ئووب و یانیسای ولینا)یە کە دەڕژێنە زەریای بەستەڵەکی باکوورەوە.

٦- رووباری ئەردەن: دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا، دەڕژێتە دەریای مردوو.

## ٢- دەریاچەکان:

جگە لە دەریاچەی مردوو چەند دەریاچەیەکی گرنگی تر لە کیشوەری ئاسیا هەن وەك:

١- دەریاچەی قەزوێن (خەزەر): گەورەترین دەریاچەی سوورە لە جیهاندا رووبەرەکەی (٣٩٤) هەزار کم٢ بۆیە بەناوی دەریا ناو دەبرێت.

٢- دەریاچەی بەلقاش: لە وڵاتی کازاخستان، ئاوەکەی سوێرە.

٣- دەریاچەی ئاراڵ: بەناوی دەریای ئاراڵیش ناسراوەبە پلەی دووەم دێت لە رووی رووبەر لە نێو دەریاچەکانی ئاسیا نزیکەی ٦٤ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.

٤- دەریاچەی بایکال: رووبەرەکەی ٣١,٥ هەزار کیلۆ مەتر چوار گۆشەیە.

## دووەم: ئاو و هەوا :-

لەبەر گەورەیی و فراوانی وشکانی سەر ڕووی کیشوەری ئاسیا زۆربەی هەرێمەکانی ئاوهەوای تێدا دەردەکەوێت، ئەو هەرێمانەش لەمانەی خوارەوە پێکهاتوون:

١- هەرێمی ئاوو هەوای کەمەرەیی: کە بەشە دووەرەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا دەگرێتەوە بەتایبەتی ئەندونیسیا، باران لێرەدا بە درێژایی سالْ دەبارێت تێکرای پلەی گەرمی سالانەی لە نێوان ٢٢-٢٥ پلەی سەدی دایە.

٢- هەرێمی ئاوو هەوای وەرزی: ئەو هەرێمە ناوچەکانی هیند و هیندی چینی و فلیپین دەگرێتەوە، زستانەکەی شلەتێنەو پلەی گەرمی تیا نەرم دەبێتەوە لە هەردوو مانگی کانوونی دووەم و شوباتدا و بارانشی کەم لێ دەبارێت، بەلام وەرزی هاوین وەرزی باران و گەرمیە بۆیە بارانی زۆری لێ دەبارێت.

٣- هەرێمی ئاوو هەوای مەنشووری سارد: باکووری چین و ئەوپەڕی باکووری ژاپۆن و دوورگەکانی سەخالین دەگرێتەوە دەگرێتەوە و تێکڕای پلەی گەرمی زستانەکەی دەگاتە ١٥ پلەی سەدی لە ژێر سفرەوە لە هەندێ جێگادا و پلەی گەرمی هاوینی دەگاتە ٢٠ پلەی سەدی.

٤- هەرێمی ئاوو هەوای چینی: رۆژهەلات وباشووری چین و باشووری ژاپۆنیش دەگرێتەوە، هەروەها لە رووی گەرمیەوە هاوشێوەیە لەگەلْ رۆژئاوای ئاسیاوە، بەلام لە رووی بارانەوە جیاوازە لە ناوچەی یەکەم دا باران بە درێژایی سالْدا دەبارێت، بەلام لەناوچەی دووەمدا باران تەنها لە وەرزی زستاندا دەبارێت.

٥- هـەرێمی ئـاوو هـەوای دەریـای ناوەڕاسـت: ڕۆژئـاواو باشـووری ڕۆژئـاوای ئاسیا دەگرێتەوە (کوردستان بەگشتی، تورکیا، ولاتـانی شـام) زسـتانی ئـەم ناوچەیە سارد و بەبارانە و هاوینەکەی گەرم و بێ بارانە.

٦- هەرێمی ئاوو هەوای بیابانی:ئەم دابەش دەبێت بەسەر دوو هەرێمەوە:

أ- هەرێمی بیابانی گـەرم: بیابانـەکانی نیمچـە دوورگـەی عـەرەب و عێـراق و شام دۆڵی سیند بیبانی سار (ثار) دەگرێتەوە، پلەی گەرمای لێرە زۆر بـەرزە لە هاویندا.

ب- هـەرێمی بیابـانی مـام ناوەنـدی: بانـەکانی تیبـت و ئێـران و ناوەڕاسـتی ئاسـیا دەگرێتـەوە، ئـەم هەرێمـە بـەوە جیـا دەکرێتـەوە کەمـەودای گـەرمی (جیـاوازی لـەنێوان گـەرمی زسـتان و هـاوین و شـەوو ڕۆژ زۆرە و بارانیشـی کەمترە لە ٣٠٠ میللیمەتر ساڵانە.

٧- هـەرێمی ئـاوو هـەوای سـاردو شـێدار: ناوچـە کیشـوەریەکانی ئاسـیا دەگرێتەوە لە مەنگۆلیاو ڕۆژئاوای سیبیریادا.

٨- هـەرێمی ئـاوو هـەوای تەنـدرا: بەشـی بـاکووری کیشـوەری ئاسـیا دەگرێتەوە، بـەوە جیـا دەکرێتـەوە کـە زسـتانێکی درێـژ زۆر سـاردی هەیـەو هاوینێکی کورت و ئاوو هەوا مام ناوەندی هەیـە، بـە درێـژایی زسـتان بەبـەفر داپۆشراوە لـە هاوینیشـدا بەفرەکـە دەتوێتـەوە و دەبێتـە هـۆی دەرکـەوتنی هەندی گژوگیا.

## ج. رووەکی سروشتی :

بەگوێرەی باسی رابردوو کە دەرکەوت کیشوەری ئاسیا چەندین جۆر ئاووهەوای هەیە و چەندین ناوچەی بەرز و نزمی جیاجیای هەیە بەرووبەرێکی فراوانەوە، بێگومان ئەوە دەبێتە هۆی جۆراوجۆر بوونی رووەکی سروشتی و ئاژەڵ لە کیشوەرەکەدا.

**لە کیشوەری ئاسیادا ئەم هەرێمە رووەکە سروشتیانە بە دی دەکرێن:**

١- هەرێمی دارستانی کەمەرەیی: دەکەوێتە ئەوپەڕی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، لە ئەندونیسیا بەتایبەتی.

٢- هەرێمی دارستانی وەرزی: لە نیمچە کیشوەری هیند و مالیزیا وهیندی چینی و باشووری چین بەدی دەکرێت.

٣- هەرێمی گژو گیای تەندرا: لە شی باکووری کیشوەرەکە بەدی دەکرێت.

٤- هەرێمی دارستانی سنۆبەری: بە هەرێمی تایگا ناسراوە، دەکەوێتە باشووری هەرێمی تەندرا.

٥- هەرێمی رووەکی دەریای ناوەڕاست: لە رۆژئاواو باشووری رۆژئاوای ئاسیا لەو شوێنانەی کە خاوەنی ئاووهەوای دەریای ناوەڕاستن دەردەکەون.

٦- هەرێمی رووەکی بیابانی: هەرێمێکی هەژارە لە رووی رووەکەوە لە بیابانەکانی ئاسیا بەدەردەکەوێت.

٧- هەرێمی گژو گیای ئەستێپس: دەکەوێتە رۆژئاوای سیبیریا و ناوەڕاستی مەنشۆریا.

٨- هەرێمی دارستانی تێکەڵاو: دەکەوێتە باکوورو رۆژهەڵاتی چین و بەشێك لە مەنشۆریاو ناوەڕاستی ژاپۆن.

## ٣- دانیشتوانی ئاسیا :

ڕێژەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ئاسیا کۆبوونەتەوە لە ڕووبەرێکی بچووک لەم کیشوەرەدا، بەتایبەتی لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا، بەڵام ڕێژەیەکی کەم لە دانیشتوان لە باکوور و ناوەڕاست و باشووری ڕۆژئاوای ئاسیادا دەژین، واتە چڕی دانیشتوان لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر جیاوازە، چڕی هەرە بەرز دەکەوێتە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات و بەشێکی زۆر لە باشووری ئاسیا، ئەم چڕییە لەو ناوچانەدا دەگاتە (٥٨٠) کەس لە هەر کیلۆمەترێکی چوار گۆشەدا لەو کاتەی کە چڕی دانیشتوانی ئاسیا بەشێوەیەکی گشتی (٨٤) کەسە لە هەر کیلۆمەترێکی چوارگۆشەدا.

## أ- گەلان و زمانەکانی ئاسیا :

لە ڕووی ڕەچەڵەکی دانیشتوان ئاسیا بەپێی زانستی ئەثنوگرافیا[١] دابەشدەبێت بە سەر دوو ڕەگەزی سەرەکی:

**١- ڕەگەزی ئاسیایی:** (ڕەگەزی زەرد) لە ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات ئاسیا نیشتەجێبوونە. نموونەی ئەو ڕەگەزە چینیەکان و یابانیەکانە.

**٢- ڕەگەزی قەوقازی:** لە باشووری ڕۆژئاواو ناوەڕاست و ڕۆسیادا. هەریەکی لە مانەش دابەشدەبن بەسەر چەند بەشی لاوەکی تر. نەتەوەی کورد یەکێکە لەو ڕەگەزانە.

---

[١] ئەثنوگرافیا: ئەو زانستەیە لە ڕەگەزو ڕەچەڵەکی دانیشتوان دەکۆڵێتەوە.

## ب- دابەشبوونی جوگرافی دانیشتوان:

لە ساڵی ٢٠٠٠ ژمارەی دانیشتوانی ئاسیا بە ٣,٧٣ ملیار کەس مەزندەکراوە. ڕێژەی لە ٤٠٪ لەم ژمارەیە لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیادان، هەروەها ٤٠٪ تریش لە باشوور و ناوەڕاستی ئاسیادا دەژین ڕێژەی ١٥٪ ئەم دانیشتوانە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا جێگیربوونە ڕێژەی ٥ ٪ دانیشتوان لە ڕۆژئاوای ئاسیا شوێنەکانی تر دەژین.

هەردوو وڵاتی چین و هیند ژمارەی دانیشتوانیان ٢,٣ ملیار کەسە واتە یەك لەسەر سێی ژمارەی دانیشتوانی جیهان نزیکەی ٦٢٪ دانیشتوانی کیشوەری ئاسیا پێکدێنێت. بەگشتی چڕی دانیشتوان لە ئاسیا دا دەگاتە ٨٤ کەسە لە هەر کیلۆمەترێکی چوار گۆشەدا، ئەم ژمارەیەش بەرزترە لە هەموو کیشوەرەکانی تر.




نەخشەی ڕامیاری ئاسیا

## ٤- ئابووری ئاسیا:

زۆر لـــه ولاّتـــانی ئاســـیا لـــه رووی ئابووریـــەوە پاشـــکەوتوون، زۆربـــەی دانیشـتوانی ئاسـیا لـه بـواری کشـتوکاڵیدا کاردەکـەن، کشـتوکالیەکەش بـە گشتی بەوە دەناسـرێت کـە بەرهەمەکـەی کەمـە، خـەڵکانێکی کـەم لـەبواری پیشەسازیدا کاردەکەن زیاتر لە کەرتی خزمەتگوزاری چالاکی دەنوێنن وەکـو فرۆشـیارە گەڕۆکـەکان و خـاوەن پیشـە دەسـتیەکان. بەشـێوەیەکی گشـتی بوارەکانی ئابووری لە مانەی خوارەوە پێکدێت:

## کشتوکاڵ لە ئاسیادا:

کـەمتر لـە یـەك لەسـەر سـێی زەوی کیشـوەری ئاسـیا بـۆ کشـتوکاڵ بـەکاردێت، بـەکارهێنانی کەرسـتەی سـاکار و سـەرەتاییەکان و بـەکارهێنانی ئاژەڵ لە کێڵانی زەوی شتێکی زۆر بڵاوە. لەبەرهەمە کشـتوکاڵیە گرنگـەکانی ئاسیا بەرهەمی برنجـە، برنج لـەباروددۆخێکی شـێدار گەشـەدەکات، بۆیـە لـە ولاّتانی رۆژهەلاّت و باشووری رۆژهەلاّت و باشووری ئاسیادا دەچێنرێت. ئـەم بەرهەمە لەم ولاّتانە ساڵێ دوو جار دەچێنرێت. جێگـای ئاماژەیـە کـە دابـڕی زەوی لەم بەرهەمە لە هەموو ولاّتێك وەك یـەك نییـە، دابـڕی زەوی لـە هینـد تـەنها دەگاتە نیوەی دابڕی ژاپۆندا. ولاّتانی ئاسیا نزیکەی رێژەی ٩٠٪ برنجی جیهان بەرهەم دێنن، تەنها چین و هیند نزیکـەی رێـژەی ٦٠٪ لـەکۆی گشـتی برنجی جیهان بەرهەم دێنن. لەگەڵ برنج لە ئاسیادا گەنم و جۆش رووبـەرێکی فـراوان داگیردەکـەن لـە زەویـە کشـتوکاڵیەکان، هـەروەها ئـاژەڵیش بـە خێودەکرێت بۆ مەبەستی گۆشت وەدەست هێنـان ، هـەروەها بـۆ وەدەسـت هێنانی شیرو گۆشت و خوریو داو بەتایبەتی لە ولاّتە پێشکەوتووەکان وەك ژاپۆن و کۆریای باشوور و چین دا.

## پیشەسازی:-

پیشەسازی ئێستا لە ئاسیادا پێشکەوتنی خێرا بە خۆیەوە دەبینێت. لە پێشەنگی ولاٌتە پیشەسازەکانی ئاسیا ولاٌتی ژاپۆنە کە پیشەسازیەکی هەمەجۆر و زۆر پێشکەوتووی هەیە و لە ریزی ولاٌتە هەرە پێشکەوتووەکانی ئەلیکترۆنیات و ئۆتۆمبێل وزە و کەرتی بیناسازی بەناوبانگە. پیشەسازی لە ژاپۆندا نزیکەی چاریەگی هێزی کاری ولاٌتی تێدا کاردەکات. لە دوای ژاپۆن ولاٌتانی چین و رووسیا وهیند دێن. لە شەستەکانەوە زۆر لەولاٌتانی ئاسیا چوونە ریزی ولاٌتە پیشەسازیەکانەوە وەك سنگافوورە و کۆریای باشوور و ئەندونیسیا و مالیزیا و هۆنگ کۆنگ و تایلاند. زۆربەی بەرهەمی ئەم ولاٌتانە لە جل وبەرگ و پێلاو و تەلەفزیۆن و ئامێری ڤیدۆ پێکدێت.

# بەندی دووەم
# ئەوروپا



نەخشەی سروشتی ئەوروپا

# جوگرافیای سروشتی ئەورووپا

## شوێنی جوگرافی و ڕووبەر:

کیشوەری ئەورووپا دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی ٣٦-٧١ پلە باکوور و هێلی درێژی ١٠ پلە ڕۆژ ئاوا – ٦٧ پلە ڕۆژهەلات، ئەورووپا دوای کیشوەری ئوسترالیا دووەم بچووکترین کیشوەری جیهانە و دەکەوێتە نیوە گۆی باکووری زەوییەوە. ڕووبەرەکەی ١٠,٣ ملیۆن کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و لە ٧٪ ی ڕووبەری وشکایی گۆی زەوی پێکدێنێ.

لەسەر نەخشە ئەم کیشوەرە وەك نیمچە دوورگەیەکی گەورەیەو لە کیشوەری ئاسیاوە درێژ بووتەوە بەرەو ڕۆژئاوا، کیشوەری ئەورووپا لە باکوورەوە زەریای بەستەڵەکی باکوور و لە ڕۆژئاواوە زەریای ئەتڵەسی و لە باشوورەوە دەریای ناوەڕاست و دەریای ڕەش سنووری ئاوی کیشوەرەکە پێکدێنن، لە ڕۆژهەلات بە وشکانی بە کیشوەری ئاسیاوە بەستراوەتەوە تەنها زنجیرە چیایەکی نزم کە بریتییە لە زنجیرە چیای ئۆرال لە یەکیان دادەبڕێت.

## پێکهاتەکانی سەر ڕووی زەوی (بەرزی و نزمی):

ئەورووپا لە کۆمەڵە زنجیرە چیایەك و چەند دەشت و بانێك پێکدێت، دەکرێ بەم شێوەی خوارەوە ڕیزیان بکەین:

١- **بەرزاییەکانی باکووری ڕۆژئاوا:** ئەمەش بەرزاییەکانی نیمچە دوورگەی سکاندناڤیا (سوید و نەرویج) و باکوورو ڕۆژئاوای بەریتانیا و باکووری ڕۆژهەلاتی ئێرلەندا و بەشی باکووری ڕۆژئاوای فەرەنسا دەگرێتەوە. بەرزاییەکانی سکاندناڤیا لە ڕووی جیۆلۆجییەوە پێکهاتێکی کۆنی هەیە و دووچاری ڕامالینێکی زۆری سەهۆڵبەندەنەکان هاتووە، هەر بۆیەش ئەم

ناوچـەی دەریاچـە و تەنگەبـەرە ئاوییـەکان (فیـۆرد)ی زۆرە کـە ئەمانـەش بەهۆی چاخە سەهۆڵبەندانەکانەوە دروست بوون.

**٢- دەشـتەکانی ناوەڕاسـت و کـەنار دەریـا:** دەشـتەکانی کـەنار دەریـا وەك پشتێنەیەك بە کەنار دەریاکان درێژ بۆتەوە کە ئەمەش کـەنارەکانی زەریـای ئەتڵەسی و دەریای باڵتیك دەگرێتـەوە. هەرچـی دەشـتەکانی ناوەڕاسـتە کـە دەشـتێکی روو تەختــە، گـەورەترینیان ئــەو دەشــتەیە کـە لــە باشــووری فەرەنساوە دەستپێدەکات بەرەو باکوور و رۆژهەلات بە ئـەڵمانیاو پۆلەنـدە و ئۆکرانیا تێپەڕ دەبێت تا دەگات بە زنجیرە چیاکانی ئـۆڕال لـە ڕووسـیا، ئـەم دەشتە پانتاییەکی گەورە لە ئـەورووپا دەگرێتـەوە و بـە دەشـتە مەزنەکـەی ئەورووپا ناسراوە.

**٣- بانــەکان:** زۆربــەری بانــەکانی ئــەورووپا دەکەونــە باشــووری دەشــتە مەزنەکـەی ئـەورووپا کـە بـەناوبانگترینیان بـانی (مێزیتـا)یـە لـە ناوەڕاسـتی ئیسپانیا و بانی فەرەنسایناوەڕاست لە فەرەنسا.

**٤- بەرزاییەکانی ئەلپ:** کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

ئەمانــەش چـەند زنجـیرە چـیایەکی هاوتــەریبی بـەرزن، لوتکـەی مـون بـلان بەرزترین لوتکەیە لە ئەورووپا کە بەرزییەکەی ٤٨٠٧ مەترە لـە سـەر ئاسـتی ڕووی دەریاوە.لە فەرەنساوە دەستپێدەکات بۆ باکووری ئیتاڵیا و نەمسا، لە ڕووی جیۆلۆجییەوە پێکهاتەکەی نوێیە.

## ئـــاووهـەوا:

ئاوو هەوای کیشوەری ئەورووپا بە گشتی فێنك و باراناوییە، هەر چوار وەرزەکەی ساڵی بە روونی تیادا بەدەردەکەوێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ هەڵکەوتنی شوێنی جوکرافی ئەورووپا و ئەو دەریا و زەریایانەی دەوریان داوە.

ئەورووپا هەرێمی ئاووهەوای هەمەچەشنی هەیە، دەکرێ بەمجۆرەی خوارەو دابەشیان بکەین:

١- هەرێمی ئاووهەوای تەندرا (باکووری ئەورووپا)

٢- هەرێمی ئاووهەوای رۆژئاوای ئەورووپا

٣- هەرێمی ئاووهەوای ناوەڕاستی ئەورووپا

٤- هەرێمی ئاووهەوای رۆژهەڵاتی ئەورووپا

٥- هەرێمی ئاووهەوای دەریای ناوەڕاست

## رووبارو دەریاچەکان:

ئەورووپا کیشوەرێکی دەوڵەمەندە بە سامانی ئاو و خاوەنی تۆرێکی فراوانی رووبارە. رووبارەکانی ئەورووپا بە شێوەیەکی سەرەکی بەکاردەهێنرێن بۆ گواستنەوە و دروستکردنی وزەی کارەبا. گرنگترین رووبارەکانی ئەورووپا بریتین لە:

١- رووباری ڤۆلگا: درێژترین رووباری کیشوەری ئەورووپایە و دەرژێتە دەریای قەزوین.

٢- رووباری دانوب: کە لە رۆژئاواوە بەرەو رۆژهەڵات دەڕوات و دەرژێتە دەریای رەش.

٣- ڕووباری ڕاین: کە بەرەو باکوور دەڕوات و دەڕژێتە دەریای باکوور، و بەشێوەیەکی فراوان بۆ گواستنەوە بەکاردێت.

٤- ڕووباری دنێبەر: لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕوات و دەڕژێتە دەریای ڕەش.

جگە لە ڕووبارەکان، کیشوەری ئەورووپا خاوەنی ژمارەیەکی زۆرە لە دەریاچە(البحیرات).ئەورووپا دەڕوانێتە سەر دەریاچەی قەزوین کە گەورەترین دەریاچەی سوورە لە جیهاندا و لەبەر گەورەیی بە دەریای قەزوین ناودەبرێ. بەناوبانگترین دەریاچەکانی رووسیا ئەورووپی بە درێژایی ٤٥٠ میل (٧٧٠کم) بریتییە لە هەردوو دەریاچەی لادوزکۆ و ئونژکو کەدەکەونە باکووری ڕۆژئاوای ڕووسیا و دەریاچەی جنیڤ لە سویسرا و بەلاتون لە هەنگاریا.

## ڕووەکی سروشتی:

دەکرێ ڕووەکە سروشتییە هەمەچەشنەکانی کیشوەری ئەورووپا و جۆرەکانی و دابەشبونی جوگرافی لەمانەی خوارەوە کورت بکرێنەوە:

**١- هەرێمی تەندرا:** ئەم هەرێمە دەکەوێتە بەشی باکوور لە ئەورووپا، ڕووەکی ئەم هەرێمە بەهۆی درێژی وەرزی زستان و ساردی ناوچەکە، تەنها لە ناوەڕاستی وەرزی هاویندا گژوگیای کورت و قەوزەی لێدەڕوێت.

**٢- هەرێمی دارستانە سنەوبەریەکان(تایگا):** ئەم هەرێمە دەکەوێتە باشووری هەرێمی ڕووەکی تەندراوە و بەدارو درەختی سنەوبەری داپۆشراوە، باران بارینی لە هەرێمی تەندرا زیاترە، ئەم هەرێمە هەندێك ئاژەڵی کێوی وەك ورچ و گورگ و ڕێوی و مامزی لێدەژی.

**٣- هەرێمی دارستانە تێکەڵەکان:** ئەم هەرێمە ناوچەیەکی بەرفراوان لە ئەورووپا دەگرێتەوە هەر لە دورگەکانی بەریتانیا لە رۆژئاواوە درێژ دەبێتەوە تا چیاکانی ئۆرال لە رۆژهەڵات، لە باکوورەوە لە باشووری هەرێمی دارستانە سنۆبەریەکان دەستپێدەکات تا ناوەڕاستی ئەورووپا و باکووری رۆژئاوای ئیسپانیا. لەم هەرێمە دارستانی سنەوبەری کەم دەبێتەوە و درەختی گەڵا پان دەسپێدەکات. زۆربەری درەختەکانی ئەم هەرێمە بەهۆی پیشەسازی و کانزا کردنەوە براونەتەوە یان زەوییەکانی بۆ کشتوکاڵ بەکارهاتووە.

**٤- هەرێمی رووەکەکانی دەریای ناوەڕاست:** ئەم هەرێمە رووەکییە لەو وڵاتانەدا هەیە کە دەڕواننە سەر دەریای ناوەڕاست، رووەکی ئەم هەرێمە بەهۆی ئاووهەوای دەریای ناوەڕاست کە بارانی کەم و پلەی گەرمی بەرزە، ئەو درەختانەی بڵاوە کە بەرگەی وشکی و گەرمای هاوین دەگرن وەك درەختی زەیتون و تەپەدۆر و گوێز. ئەم هەرێمەش وەك هەرێمی پێشوو بەهۆی زۆری پیشەسازی و کشتوکاڵکردن و بڕینەوەی درەخت، بەشێکی زۆری رووەکە سروشتیەکانی لەناوچوون.

**٥- هەرێمی گژوگیا (ستێپس):** ئەم هەرێمە لە باشووری پشتێنەی دارستانی روسیاوە دەستپێدەکات تا حەوزی خوارەوەی رووباری دانوب. ئەم هەرێمە بەگژوگیای کورت داپۆشراوە و پێیدەگوترێت ستێپس.

# جوگرافیای مرۆیی ئەورووپا

دانیشتوانی ئەورووپا لـە سـاڵی ٢٠٠٤ دا لـە دەوروبـەری ٧٣٥ ملیـۆن کەس بوو. بەم پێیە چڕی دانیشـتوانەکەی دەگاتـە نزیکـەی (٧١) کـەس لـە کیلۆمەتری چوارگۆشەدا.




## نەژادە سەرەکییەکانی ئەورووپا :

کیشوەری ئەورووپا دانیشتوانەکەی بۆ چـەندین نـەژادی سـەرەکی دابـەش دەبن، بەڵام بە گشتی تێکڕای کیشوەرەکە سەر بە نەژادی قەوقازین.

نـــەژادەکانی ئـــەورووپا بـــە چـــەندین جـــۆری جیـــاواز دابەشـــکراون، بـــەڵام گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

**١- نەژادی (نۆردیك):** ئەم نەژادە دانیشتوانی باکوور و باکووری رۆژئاوای کیشوەرەکە دەگرێتەوە. قژ زەرد و چاوشینن، بالآیان بەرز و کەللە سەریان درێژە.

**٢- نەژادی ئالپی:** ئەم نەژادە دانیشتوانی ناوچەی ئالپ و بەشێك لە ناوەڕاست و رۆژهەلاتی ئەوروپا دەگرێتەوە. قژیان رەشی مەیلەو قاوەییە، بالآیان کورتە و کەللە سەریان پانە.

**٣- نەژادی دەریای ناوەڕاست:** ئەم نەژادە دانیشتوانی ئەو ولآتانە دەگرێتەوە کە دەڕواننە سەر دەریای ناوەڕاست.

## گەشەسەندنی دانیشتوان لە ئەوروو پا:

تێکرای رێژەی گەشەسەندنی دانیشتوان لەم کیشوەرە بەردەوام لە کەم بوونەوەیە بە تایبەتی لە دوای نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دەستیپێکرد، ئەمە لە کاتێك لەم کیشوەرە بە تایبەتی لە بەشی رۆژئاوای پێشکەوتنی گەورە هاتۆتە دی لە بواری تەندروستی و باشبوونی گوزەرانی خەلك و درێژ بوونەوەی تەمەن و نزم بوونەوەی تێکرای نەمردنی مندالی ساوا،.....هتد.

## هۆکارەکانی کەمی گەشەی دانیشتوان لە ئەورووپا:

١- لە ئەورووپا لە دوای ساڵەکانی ١٩٦٠ بەکارهێنانی رێگاکانی رێکخستنی منداڵ بوون بە شێوەیەکی فراوان پەرەی سەند، ئەمەش لە پێناو دروستکردن و رێکخستنی خێزان بوو بە منداڵی کەم.

٢- ئافرەتان لە کۆمەڵگەکانی ئەورووپا بە ژمارەی زۆر کەوتنە کارکردن لە دەرەوەی ماڵ و بەمەش دوور کەوتنەوە لە ناوماڵ و بەخێوکردنی منداڵ یان ژیان بەسەر بردن بەبێ منداڵ و دروست نەکردنی خێزان.

٣- لە زۆربەی وڵاتانی قەوارەی خێزان زیاتر بەرەو بچووک بوونەوە دەچێت، بارودۆخی ژیان و گوزەران لەم وڵاتانە وا پێویست دەکات کە خێزان بچووک بێت.

## جوگرافیای ئابووری ئەورووپا

کیشوەری ئەورووپا چالاکی ئابوری جۆراوجۆری هەیە، لێرەدا بە کورتی باس لە هەندێك چالاکی ئابووری دەکەین:

### چالاکی کشتوکاڵ:

کشتوکاڵکردن یەکێکە لە چالاکیە ئابورییەکانی ئەورووپا، کیشوەری ئەورووپا لە ڕووی ئاووهەواوە بە تایبەتی گەرما و باران بارینەوە بە گشتی بە کیشوەرێکی گونجاو دادەنرێت بۆ کشتوکال، بێجگە لە هەندێك شوێنی کیشوەرەکە نەبێت کە ئاووهەواکەی زۆر ساردە، وەك ناوچەکانی نزیك جەمسەری باکوور یان ئەو ناوچانەی شاخاوی سەختن.

زۆربەی زەوییەکانی کیشوەری ئەورووپا بارانیان بەپێی پێویست لێدەبارێ بۆ کشتوکاڵ، هەرچی ناوچەکانی دەریای ناوەڕاستە ئەویش وەك پێویست بارانی هەیە و لەو شوێنانەش کە بارانی کەمە سیستەمی ئاودێری بەکاردەهێنرێت.

ئەورووپا هەمیشە بەوە ناسراوە کە لە ڕووی سیستەمی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیەوە هەمەچەشن بووە، تەکنیکی کشتوکاڵکردن لەم کیشوەرە بەردەوام لە گۆڕاندا بووە. گرنگترین بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی ئەم کیشوەرە بریتییە لە: دانەوێڵە (گەنم، جۆ، گەنمەشامی)، پەتاتە، میوەهات(سێو، ترێ، پرتەقاڵ)، زەیتون، ئەمە جگە لە بەخێوکردنی ئاژەڵ.

## چالاکی پیشەسازی و کانزاکردن:

بەرهەمهێنان لە کەرتی پیشەسازی و کانزاکردن لە ئەورووپا دە جار لە کەرتی کشتوکاڵکردن زیاترە، ئەورووپا لە بەرهەمهێنانی پیشەسازیدا لە پێشەنگی کیشوەرەکانی دنیایە، بەشێکی زۆری پیشەسازیە گرنگەکانی وەك پیشەسازی ئۆتۆمبێل و تەیارە و شەمەندەفەر و کەشتی و ئامێری ڕستن و چنین و مەکینەی جۆراوجۆر لەم کیشوەرە کۆبۆتەوە.

پیشەسازی لە ئەورووپاوە لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی کە لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمەوە لە بەریتانیاوە سەریهەڵداوە، دەستپێدەکات و لەپاشان زۆر بەخێرای بە وڵاتانی دی ئەورووپای ڕۆژئاوا بڵاوبووەوە، بە تایبەتی لەو شوێنانەی کە ژمارەیەکی زۆر کانی خەڵوزی لێبوو. ناوکی پیشەسازی ئەورووپا کە وڵاتانی بەریتانیا و ئەڵمانیا و بەلجیکا و هۆڵەندە و فەرەنسا دەگرێتەوە تاوەکو ئەمڕۆش پیشەسازییەکانیان لەو ناوچانە کۆبۆتەوە کە کانی خەڵوزی بە ڕادەیەکی زۆر لێ بڵاوبۆتەوە، لە دەوروبەری ئەو ناوکە وڵاتانی دی پیشەسازی هەن وەك باشوور و ناوەڕاست سوید، سویسرا ، باکووری ئیتالیا ، ناوچەی بەرشلۆنە لە ئیسپانیا، بەڵام ناوچەکانی باشووری ئیتاڵیا، باشووری نیمچە دوورگەی ئیبریاو ئێرلەندا و ئایسلەندەو یۆنان، ئەم وڵاتانە کەمتر پیشەسازین، لە دوای شەڕی جیهانی دووەم لە ئەورووپا پشت بەستن بە کانی خەڵوز بۆ پیشەسازی کەمتر بووەو، ئەمەش بەهۆی هێنانی نەوت لە بەکارهێنانی لە جیاتی خەڵوز لە بواری پیشەسازییەوە.

# بەندی سێیەم

# کیشوەری ئەفریقیا

## شوێنی جوگرافی کیشوەری ئەفریقیا

کیشوەری ئەفریقیا لە ئاسیا بچووکترە، ڕووبەرەکەی زیاترە لە ٣٠ ملیون کم$^2$. وە لە ٢٣٪ی ڕووبەری وشکانی گۆیی زەوی پێك دێنێت.

دەریای سوور و نۆکەندی سوێس و کەنداوی عەدەن لە کیشوەری ئاسیا جیای دەکاتەوە و دەریای ناوەڕاست لە ئەورووپا جیای دەکاتەوە، زەریای ئەتلەسی کە دەکەوێتە ڕۆژئاوای کیشوەرەکە لە کیشوەری ئەمەریکا جیای دەکاتەوە.

ئەم کیشوەرە دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی ٣٧° باکوور ٣٥° باشووری وە هێلی یەکسان تێپەڕ دەبێت بە ناوەڕاستی و دەیکاتە دووبەشی تا ڕادەیەك یەکسان.

### بەرزی و نزمی کیشوەرەکە :

شێوە سەرەکیەکانی رووی زەوی کیشوەری ئەفریقیا بریتییە لە:

١- بانەکان: شێوەی سەرەکی رووی زەوی کیشوەرەکەیە کە زۆربەی کیشوەری ئەفریقیا پێك دەهێنێت. و لە بیابانی گەورەی ئەفریقیا لە باکوور دەست پێ دەکات تاکو هەرێمی کاپ لە باشوور. بەرزی ئەم بانە لە نێوان (٥٠٠ – ١٥٠٠ م) کە دەکرێتە سێ بەش:

أ- بانەکانی باکوور (بیابانی گەورەی ئەفریقیا) کە دەست پێ دەکات لە دەریای سوور تاکو زەریای ئەتڵەسی درێژ دەبێتەوە.

ب- بانەکانی رۆژهەڵات (بانی حەبەشە یان ئەسیوبیا) بەرزترین بانی کیشوەرەکەیە کە تێکڕای بەرزیەکەی ٢١٠٠م) لە ئاستی ڕووی دەریاوە.

جـ- بانی باشوور (بانی فیلدا) ئەم بانە پێك هاتووە لـە بەرزایـەکانی فیلـدای سەروو و بیابانی کەلهاری.

٢- چیاکان: چیاکانی کیشـوەری ئـەفریقیا بەسـەر ئـەم سێ جۆرە دابـەش دەبن:-

**أ- چیا چەماوەکان:** چیاکانی (ئەتلەس و دراکینزبیرگ) دەگرێتەوە. زنجـیرە چـیای ئەتڵەسـی دەکەوێتـە بـاکووری رۆژئـاوای ئـەفریقیا بـەرزترین لوتکـەی ٤٥٠٠م بەرزە لە ڕووی ئاستی دەریا.

بەڵام چیای دراکینـزبیرگ دەکەوێتـە باشـووری رۆژهـەڵاتی کیشـوەرەکەو وە بەرزترین لوتکەی ٣٤٨٢م لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە.

**ب- چیا شکاوەکان:**

دەکەوێتە دەوروبەری ناوچـەی دۆڵـی شـکاوی ئـەفریقیا، ئـەم دۆڵـە درێـژ دەبێتــەوە لەگـەڵ کـەنارەکانی رۆژهــەڵاتی کیشـوەر وەك زنجـیرە چـیاکانی لێواری دەریای سۆر. لێواری زۆر لێژ و ڕکن.

**جـ- چیا گڕکانەکان:**

دەکەوێتە لێـواری رۆژهـەڵاتی بـانی کیشـوەرکە وەك چـیای کلمنجـارۆ کـە بەرزترین لوتکەی (٥٨٩٥م لەسەر ئاستی دەریا بەرزە، هەروەها چیای کینیـا (٥٩١٤م) و چیای فیرۆ (٤٥٦٥م)

**ئـاووهەوا:**

کیشوەری ئەفریقیا بەو رووبەرە گەورەیـەی هەیـەتی لـە رووی ئاووهـەاوە دابەش دەبێ بەسەر چەند هەرێمێکی جیاواز کە برتین لەمانە:-

### ١- هەرێمی کەمەرەیی:

دەکەوێتە دەوروپشتی هێڵی یەکسان کە تیشکی خۆر بە درێژی ساڵ ستوونیە و درێژی شەو و ڕۆژ یەکسانە، تێکڕای ساڵانەی پلەی گەرمی ناوچەکە ٢٧° سەدی وە بارانی هەمیشەییە و لە وڵاتی کونغۆ و گابۆن و باشووری کامیرۆن.

### ٢- هەرێمی خولگەیی:

دەکەوێتە باکوور و باشووری هەرێمی پێشوو (کەمەرەیی)، تیشکی خۆر ستون و نیمچە ستوونە پلەکانی گەرما بە درێژایی ساڵ بەرزە و بارانی لە زۆربەی مانگەکانی ساڵدا دەباری بە تایبەتی لە مانگەکانی وەرزی هاوین دا.

### ٣- هەرێمی بیابانی گەرم:

دەکەوێتە باکووری هەرێمی خولگەیی لە نیوەی باکووری زەوی، لە باشووری هەرێمی خولگەیی لە نیوە گۆی باشووری زەوی. ڕادەی باران لە (٢٥٠ ملم) کەمترە و پلەی گەرمی لە ئەنجامی سامالّی ئاسمان زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵ دادەپۆشێ. بەرزترین پلەی گەرما لە ئەفریقیا لەم هەرێمەدا تۆماردەکرێ، هەروەها بەرزترین پلەی گەرمی لە جیهاندا لەم هەرێمەدا تۆمار کراوە کە ٥٨ پلەی سەدییە لە وێستگەی (عەزیزیە) لە وڵاتی لیبیا ساڵی ١٩٢٢,

### ٤- هەرێمی دەریای ناوەڕاست:

ئەم هەرێمە دەکەوێتە باکووری و باشووری کیشوەری ئەفریقیا سیفەتی ئەم هەرێمە بەرزی پلەی گەرمی وشکییە لەوەرزی هاوین و ساردو باراناویە لەزستاندا لە ئەنجامیدا بەفر دەبارێت بەتایبەتی لە لوتکە چیاکانی ناوچەکە (وەك لە بەرزاییەکانی ئەتڵەس لە باکووری ڕۆژئاوای ئەفریقیا).

### ٥- هەرێمی ئاووهەوای دەریای شێدار:

ئەم هەرێمە دەکەوێتە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا و ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە دەڕوانێتە سەر زەریای هیندی. لە ڕووی پلەی گەرماوە تێکڕای ساڵانەی دەگاتە ١٧° پلەی سەدی، بەڵام بڕی بارانی ساڵانەی زیاترە لە ١٠٠٠ ملیمتر و وەرزی دابارینی جیاوازە، چونکە لە هەندێك بەشدا باران لە ماوەی ٦ مانگ دەبارێ، بەڵام ناوچەی تر هەیە بارانی بە درێژایی ساڵدا دەبارێت.

### ٦- هەرێمی ئەسیوبی (حەبەشە):

ئەم هەرێمە دەکەوێتە بەرزایەکانی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا بەهۆی بەرزی لەسەر ئاستی ڕووی دەریاوە پلەی گەرمی کەمترە بەبەراورد لەگەڵ ناوچەکانی دەوروبەری، پلەی گەرمی ساڵانەی لە دەوروبەری (١٧°س) و دابارینی (١٢٥٠ملم).

## گرنگترین ڕووبارو دەریاچەکانی ئەفریقیا

### ١- ڕووبارەکانی:

دەتوانین ڕووبارەکانی کیشوەری ئەفریقیا بەپێی ئاراستەی ڕێرەوەکەی بیکەین بەسێ بەش:-

أ- ئەو ڕووبارانەی دەرژێنە دەریای ناوەڕاست گرنگترین رووبارەکانی ئەم ناوچەیە ڕووباری نیلە کە درێژترین ڕووباری ئەفریقیایە (٦٧٠٠کم) لە بانەکانی رۆژهەلاتی ئەفریقیا هەل دەقولیت رووبارەکە لە باشوورەوە بەرەو باکوورە دەڕوات تاکو دەڕژێتە دەریای ناوەڕاست، ئاوی ڕووباری نیل بەکەلك بەرهەم هێنانی وزەی کارەبا دێت، هەروەها هۆی پەیدابوونی کشتوکالە لە میسر، هەروەها بۆ ڕاوە ماسی و هاتوچۆی ئاوی بەکاردەهێنرێت.

### ب- ئەو ڕووبارانەی دەرژێنە زەریای ئەتلەسی:

گرنگترین ڕووبارەکانی ئەم ناوچەیە (ڕووباری کۆنغو و نیجەر و ئورەنج و سنغال) ئەم ڕووبارانە بەوە دەناسرێت کە ڕووبەری ئاوەزلیان گەورەیەو ڕووبارەکان درێژن.

جـ- ئەو ڕووبارانەی دەرژێنە زەریای هیندی:

ئەم کۆمەڵەیە ژمارەیەك لە ڕووبار لە خۆوە دەگرێ. ئەو ڕووبارانە بریتین لە (شاباله ، جوبا ، تانا ، ڕوفوما ، زەمبێزی ، لیمپۆپۆ) ئەم ڕووبارانە بە شێوەیەکی گشتی درێژیان کەمترە لەو ڕووبارانەی کە دەرژێنە زەریای ئەتلەسی.

### - دەریاچەکانی کیشوەرەکە:

زۆربەی دەریاچە گەورەکانی ئەفریقیا دەکەوێتە بەشی رۆژهەڵاتی کیشوەرەکە، کە ژمارەیان لە هەشت دەریاچە زیاترە نموونەیان (دەریاچەی مەلاوی ، دەریاچەی نیاسا ، دەریاچەی تەنجانیقا ، دەریاچەی کیڤو ، دەریاچەی ئەلبیرت ، ... هتد) بەڵام گرنگترینیان و گەورەترینیان دەریاچەی (ڤیکتۆریا)یە. ئەم دەریاچانە سەروچاوەی هەندێك لە ڕووبارەکانن.




نەخشەی ئەفریقیا

## ڕووەکی سروشتی لە ئەفریقیا :

ڕووەکی سروشتی لە ئەفریقیا بۆ ئەم هەرێمانە دابەش دەکرێ.

**١- دارستانی کەمەرەیی:** لە ناوەڕاستی ئەفریقیا بەدیاردەکەوێت، گەڵا پانن لە نێوانیان دا ڕووەکی هەڵواسراو هەیە درێژی دارەکان بە شێوەیەکی گشتی لە نێوان ٥٠ – ٧٠ مەترە و پانی دارەکان (٢ – ٤) مەترە، گرنگترین دارەکانی (ساج و لاستیك).

**٢- هەرێمی دەریای ناوەڕاست:** ئەم هەرێمە دەکەوێتە بەشی باکوور و باشووری ئەفریقیا، درەختە سروشتیەکانی هەرێمی دەریای ناوەڕاست هەمیشە سەوزن، گرنگترین دارەکانی (فلین و بەڕو و سنۆبەر و ئەسپینداره).

**٣- دارستانی ناوچەی ئاووهەوای مام ناوەندی گەرم:** دارەکانی چڕی کەمترە بە بەراورد لەگەڵ هەرێمی دارستانی کەمەرەیی نمونەی دارەکانی ئەم هەرێمە (خورمای رون و داری سرخس و هەندێك ڕووەکی زۆنگەکانی).

**٤- دارستانی هەرێمی ئەسیوبی:** دارەکانی کورت ترە و کەم چڕترە لە دارستانی کەمەرەیی لە ئەنجامی مام ناوەندی پلەی گەرما، باشترین ناوچەی چاندنی (قاوەیە).

**٥- هەرێمی گژوگیای سەڤانا:** لە هەرێمی ئاووهەوای خولگەیی کە بارانی هاوینەیە بە دیاردەکەوێت، درێژی ئەم ڕووەکانە لە نێوان (٣ – ٤م) دایە. وە چەند بەرەو باکوور و باشوور بچین چڕیەکەی کەمتر دەبێت و درێژیەکەی کورت تر دەبێ.

**٦- هەرێمی ڕووەکی سروشتی بیابانی:** ڕووەکی ئەم هەرێمە کورتن و چڕیان کەمە و شێوەی دڕکاوی خۆیان نیشان دەدەن بە هۆی ووشکی ناوچەکە. ئەم ڕووەکانە بەرگری لە سەختی ئەو ژینگەیە بە هۆی خۆ کونجاندنیان لەگەڵ دەور و بەرەکە. هەندێکیان هەمیشە بە سەوزی دەمێننەوە، هەندێکیان دوای باران بارین سەوز دەبن و ماوەیەکی کەم زەرد هەڵدەگەڕێن و کۆتاییان پێدێت.




نەخشەی ئیداری کیشوەری ئەفریقیا

## دانیشتوانی کیشوەری ئەفریقیا

زۆر کەمە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ ڕووبەرەکەی کە زیاترە لە (٣٠ ملیۆن کم[٢])، دانیشتوانی ئەفریقیا (١٣٪) ژمارەی دانیشتوانی زەوی پێك دەهێنن، چڕی دانیشتوانی (٢٧ کەسە لەهەر کم[٢]).

بەڵام ئەم چڕیە نایەکسانە بەهۆی ئەوەی کە زۆربەی ڕووبەری ئەفریقیا (بیابان و ئاووهەوای کەمەرەییە) کە بە کەڵك نیشتەجێ بوون نایەت. گەورەترین ژمارەی دانیشتوان لە وڵاتی نیجیریایە کە دەگاتە (١٣٠ ملیۆن کەس).

### ڕەچەڵەکی دانیشتوان:

سەبارەت بە دانیشتوانی کیشوەرەکە دەکرێنە (٤)جۆر:

١- دانیشتوانە کۆنەکان (سەرەتاییەکان)

٢- ڕەش پێستەکان

٣- قەوقازییەکان

٤- حامیەکان

### دابەش بوونی دانیشتوانی کیشوەرەکە:

### ١- ناوچەی ڕۆژئاوای ئەفریقیا:

پێك دێت لە ١٧ وڵات وەك (سنغال و موریتانیا و مالی و نیجر و نایجیریا و غانا و سیرالیون و هیتر....) نزیکەی ٣٠٪ دانیشتوانی کیشوەرەکە لەم ناوچەن.

### ٢- ناوچەی ناوەڕاستی ئەفریقیا :

چڕی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە کەمە، تەنیا ١١٪ دانیشتوانی کیشوەرەکە لەم ناوچەیە نیشتەجێن.

### ٣- ناوچەی ڕۆژهەلاتی کیشوەرەکە :

ڕووبەری ئەم ناوچەیە ٤٠٪ ڕووبەری ئەفریقیایە، ٢٩٪ دانیشتوانی کیشوەرەکە لەم ناوچەن.

### ٤- ناوچەکانی باکووری کیشوەرەکە :

دانیشتوانی کەنارەکانی دەریای ناوەڕاست دەگرێتەوە وەك میسر و مەغریب و جەزائیر و تونس و لیبیا، و گەورەترین ژمارە لە دۆڵ و (دەلتای نیلە). ڕێژەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بۆ سەرجەم دانیشتوانی ئەفریقیا دەگاتە ٢٣٪.

### ٥- ناوچەکانی باشووری ئەفریقیا :

بەشەکانی خواروی ئەفریقیا دەگرێتەوە بە تایبەتی ولاتی باشووری ئەفریقیا کە تیایدا ٧٪ دانیشتوانی کیشوەرەکە دەژین.

### چالاکی ئابووری کیشوەری ئەفریقیا :

دانیشتوانی کیشوەری ئەفریقیا هەموو جۆرە چالاکیەکی ئابووریان هەیە گرنگترینیان:

## ١- کۆکردنەوە و ڕاوکردن:

ئـەم جـۆرە چـالاکیە ئێسـتا لـە چـەند جێگایـەکی جیـا جیـا هەیـە وەك دارسـتانی خولگـەیی کەمـەرەیی، لـە ناوچـە کـەم دانیشـتوانەکان، وەکـو کۆمەڵەی بوشمن و کورتە باڵاکان. کە ژمارەیان چەند هەزارێکە.

هەروەها ڕاوکردنی ماسی هەیە لە کیشوەرەکە بە تایبەتی لە کـەنارەکانی ڕۆژئاواو باکووری، ماسی وشککراو یان سوورکراو خـۆراکی سـەرەکی هەنـدێك لە دانیشتوانی ناوچەکانی کیشوەری ئەفریقیایە.

## ٢- بەخێوکردنی ئاژەڵ (شوانکاری):

یـەك لـە کارەکـانی مرۆڤـی ئەفریقیایـە لـە هـەرە کۆنـەوە ئێسـتا، بـەرەو کەمبوونەوە دەچێت، بەهۆی بەدیارکەوتنی کشتوکاڵی، بەڵام هۆیەکی گرنگـە بۆ دابینکردنی خواردن لە ڕووبەرێکی زۆری کیشوەرەکە، بە تایبـەتی ناوچەی گژوگیای کورت و ناوچەی بیابان.

جۆری ئاژەڵی بەخێوکراو لە ناوچەیەك تاکو ناوچەیەکی تر جیاوازی هەیـە بۆ نموونە وشتر تایبەتە بە بیابانی ئەفریقی و مەڕومالات و بزن لـە باشـووری ئەفریقیا بەدیاردەکەوێت کە بە شێوەیەکی بازرگانی بەخێودەکرێت.

## ٣- کشتوکاڵ:

مرۆڤـی ئـەفریقیا بـەروبومی دانەوێڵـەی چـاندووە لـە بـاکووری ئـەفریقیا (لە مەغریب و میسر و ئەسیوبیا) بە تایبەتی چاندنی گەنمەشامی و برنج.

## جۆری کشتوکالی کیشوەر دوو جۆرە:

**١- خۆ ژیاندن:** لە زۆربەی وڵاتانی کیشوەرەکە بەدی دەکرێت، وەك لە باکووری کۆنغو و تنزانیاو ملاوی و زامبیا و لیبیریا و ئوغندە هەیە، لەم جۆرە کشتوکالیە ئامێری ساکار و دواکەتوو بەکاردێت.

**٢- جۆری بازرگانی:** لەم جۆرەدا بەرهەمی کشتوکاڵی زۆربەی بۆ فرۆشتن بەرهەم دەهێنرێت و باشترین ڕێگای تەکنولوجی پێشکەوتوو بەکاردێت، گرنگترین بەرهەمە کشتوکاڵیە چاندراوەکان بریتییە لە دانەوێلە و گەنم و جۆ و برنج و گەنمەشامی و پەتاتە و قاوە و کەکاو و توتن و لۆکە.

## ٤- پیشەسازی و دەرهێنانی کانزا:

پیشەسازی و دەرهێنانی کانزا لە ئەفریقیا زۆر کۆن نییە، وە تا ئێستا هەندێك لە بەشەکانی کیشوەرەکە دوورە لەم چالاکیە. پێشکەوتنی پیشەسازی لەگەڵ پێشکەوتنی بەرهەمی کشتوکال و کانزایی بەدیارکەوت، بەلام لە دوای سەربەخۆبوونی وڵاتانی ئەفریقیا وەکو میسر و جەزائیر و نایجیریا و ئەسیوبیا و کۆماری باشووری ئەفریقیا.

پێشکەوتنی پیشەسازی دەستی پێ کرد، و بوونی کانزاکان لە هەر وڵاتێك هۆیەکی گرنگ بو بۆ ئەم پێشکەوتنە زۆربەی بەرهەمەکانی ئەم کەرتە بۆ بەکارهێنانی ناوەخۆییە وەکو (سابون ، جگەرە و پیشەسازیە خواردەمەنیەکان و ڕستن و چنین) وە لە ئەنجامی بوونی پیشەسازی بواری ئابووری و کۆمەلایەتی وڵاتەکان پەیتا پەیتا بەرەو پێشکەوتن دەڕوات.

## بەندی چوارەم
## کیشوەری ئەمەریکای ئەنگلوسەکسۆنی

### شوێنی جوگرافی:-

زاراوەی ئەنگلۆسەکسۆنی یەکێکە لە زاراوە نوێیەکان، کە بە کارهاتووە لە بڕی بەشێك لە (ئەمەریکای باکوور)، ئەم زاراوەیەش پشت بە جیاوازی شارستانی و لایەنی دانیشتوان و باری ئابووریی ئەم کیشوەرە لەگەڵ کیشوەری ئەمەریکای لاتینی دەبەستێت.

### یەکەم/ جوگرافیای سروشتی:-

لە ڕووی جوگرافییەوە کیشوەری ئەمەریکای ئەنگلۆسەکسۆنی لە هەر چوار لاوە دەور دراوە بە ئاو تەنها بەشێکی باشووری ڕۆژئاوای نەبێت بە سنووری وشکایی لە وڵاتی مەکسیك جیا دەکرێتەوە، لە نەخشەدا کیشوەری ئەنگلوسەکسۆنی (وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و کەنەدا) وە دوورگەی گرینلاند دەگرێتەوە. ڕووبەری کیشوەرەکە **(زیاتر لە ٢٢ ملیۆن کم$^2$)** کیلۆمەتر چوارگۆشەیە. کیشوەرەکە بە پلەی سێیەم دێت لە ڕووی ڕووبەرەوە لە دوای هەردوو کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا.

لە ڕووی ئەسترۆنۆمییەوە ئەمەریکای ئەنگلۆسەکسۆنی دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی **(٢٥°)** تا **(٨٣°)**ی باکووری گۆی زەوی.

### ٢- بەرزی و نزمی ڕووی زەوی: -

بەرزی و نزمی ڕووی زەوی ئەم دیاردانەی خوارەوە دەگرێتەوە:-

### أ- زنجیرە چیاكان ( شاخەكان ):-

زنجیرە چیاكان دوو بەشن ئەمانەن:-

### ١- بەرزاییەكانی ڕۆژهەلات ( ئەپەلاشیان ):

ئـەم بەرزاییانـە بـە چـیاكانی ئەبەلاشـیان ناسـراون، دەكەونـە بەشـی ڕۆژهەلاتی كیشوەرەكە لە باكووری ڕۆژهەلاتـەو بـەرەو باشـووری ڕۆژهـەلات درێژ دەبنەوە بەرزی ئەم زنجیرە چیانانە زۆر نییە، و تووشـی ڕامـاڵینی جیا جیا بوونە.

### ٢- بەرزاییەكانی ڕۆژئاوا ( كوردالیرا ):

ئـەم بەرزاییانـە لـە زنجیرەكـانی ئەپەلاشـیان نـوێترە لـە ڕووی دروسـت بوونەوە. جوولەكانی ئەلپی دروستی كردوون. بە درێژی هەڵكەوتووە لـە ئـەو پەری باكوورەوە درێژ دەبنەوە بۆ باشووری كیشوەرەكە بە درێـژایی لەگـەڵ كەنارەكانی ڕۆژئاوا، ئەم بەرزاییانە لە چەندین چیاو بان و دۆڵ پێك هـاتوون، وەك چیاكانی برۆكسی و ڕۆكی و ئەلكا و كاسـكید و سـیرانیڤادایە، بـەرزترین لوتكەی چیاكانی (ماكنلی)یـە، لـە چیاكانی ئـەلكا كـە بەرزییەكـەی دەگاتـە نزیكەی **(٦٠٩٦)** مەتر لە ئاستی ڕووی دەریـا، و بانـەكانیش، وەك بانـەكانی كۆلۆمبیا و كۆلۆرادۆ، و گـرنگترین دۆڵـیش لـەم بەرزاییانـە دۆڵـی مردنـە، كـە نزمترین دۆڵە، كە **(٦٠)**مەتر لە ژێر ئاستی ڕووی دەریایە.

### ب- بانەكان :-

بانەكان ڕووبەرێكی فراوانیان لە كیشوەرەكە گرتۆتـەوە، بـەناوبانگترینیان بـانی لۆرینسـە بـە (قـەڵغانی لۆرنسـی) ناسـراوە كـە دەكەوێتـە ناوەڕاسـتی بـاكووری ڕۆژهـەلاتی كیشـوەرەكە. نزیكـەی نیـوەی ڕووبـەری كەنـەدا پێـك دەهێنێت. بە گشتی بەرزی بانەكە لە **(١٠٠٠)** مەتر تێپەڕ ناكات.

## جـ- دەشتەکان:

دەشتەکانی ئەم کیشوەرە دوو جۆرن

### ١- دەشتەکانی کەناری دەریا:

بە درێژایی کەنارەکانی زەریای ئەتڵەنتی و کەنداوی مەکسیك لە باکوورەوە بەرەو باشوور، درێژەیان هەیە تا دەگەنە سنووری نێو دەوڵەتی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و مەکسیك. لە بەشی باکوورەوە تەسکن هەر چەندە بەرەو باشوور بڕۆین فراوان دەبن. بەرزاییان لە **(٥٠٠)** مەتر تێپەڕ ناکات گرنگترین بەندەرەکانی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا دەکەوێتە ئەم کەنارانە وەك (نیۆیۆرك – بوستن، بلتیمۆر ....هتد).

### ٢- دەشتەکانی ناوەوە:

ئەو دەشتانە دەکەونە بەشی ناوەوەی کیشوەرەکە، تێکڕای درێژیان لە باکوورەوە بۆ باشوور نزیکەی **(٤٠٠٠)** کیلۆمەتر دەبێت. و پانییەکەی **(١٩٢٠)** کیلۆمەتر دەبێت، بەرزی ئەم دەشتانە لە ڕۆژهەڵات ٤٥٠م دەبێت و تاوەکو بەرەو ڕۆژئاوە بچین بەرزیان زیاتر دەبێت تا دەگاتە ١٥٠٠م.

## ئاوو هەوای کیشوەری ئەمەریکای ئەنگلوسەکسۆنی :-

ئاووهەوای جۆراوجۆرە بەسەر ئەم هەرێمانە دابەش دەکرێن:

### أ- هەرێمی ئاوو هەوای جەمسەری :-

ئەم هەرێمە بەشی هەرە باکووری کیشوەرەکە دەگرێتەوە، هاوینی کورتە، و زستانی درێژەو زۆر ساردە پلەی گەرمی لە هەندێ شوێنی دەگاتە (–٣٤°) پلەی سەدی و لە رووی بارانەوە ، بەگشتی بارانی کەمە بە زۆری بەفری لێدەبارێت.

### ب- هەرێمی ئاوو هەوای ساردو شێدار:-

دەکەوێتە باشووری هەرێمی یەکەم، رووبەرەکەی فراوانترە، و هاوینی درێژترە و زستانی ساردە وە نزمترین تێکرای پلەی گەرمی تیایدا دەگاتە (–٣°) پلەی سەدی. زۆربەی بارانی هەرێمەکە لە هاوین دایە.

### جـ- هەرێمی ئاوو هەوای مام ناوەندی ساردی شێدار:-

ئەم هەرێمە بەشی باشووری رۆژهەلاتی کەنەدا و بەشی باکووری رۆژهەلاتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگرێتەوە. گرنگترین روالەتی ئەم هەرێمە زیادەرۆ گەرمییە (تطرف حراری) لە نێوان وەرزی هاوین و زستان.تێکرای باران بارینی سالانە لەم هەرێمەدا لە نێوان ( ٣٨٠ – ١٠٠٠) ملم.و زۆربەی بارانی ئەم هەرێمەلە وەرزی هاوین دایە.

### د- هەرێمی ئاووهەوای نیمچە خولگەیی شێدار:-

دەکەوێتە باشووری هەرێمی سەرەوە زستانی مامناوەندە، و هاوینی گەرمترە باران لەم هەرێمە دا زۆرە، ئەم هەرێمە دەکەوێتە ژێر کاریگەری گێژەلوولە خولگەییەکان کە لەم ناوچەیەدا بە(هێرکین) ناسراون.

## هـ- هەرێمی ئاووهەوای کیشوەری:

ئـەم هەرێمـە بەشـی نـاوەوەی کیشـوەرەکە دەگرێتـەوە بەتایبـەتی دەشتەکانی ناوەوە. ماوەی گەرمی بەرزە. پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە هـەر چەندە بەرەو باکووری هەرێمەکە برۆین. بڕی بـاران بـارینیش هـەر چـەند لـە ڕۆژهەڵاتـەوە بەرەو ڕۆژئاوا برۆین کەم دەبێتەوە.

## و- هەرێمی ئاووهەوای ڕۆژئـاوای کیشوەرەکان:-

کـەنارەکانی ڕۆژئـاوا لـە نێـوان بازنـەی پـانی (٤٠° – ٦٠°)ی بـاکوور دەگرێتەوە، زستانی مام ناوەندیە و هاوینی فێنکە، بارانی زۆرە و بەدرێـژایی ساڵە.

## ز- هەرێمی ئـاوو هەوای دەریای نـاوەڕاست:

هـەرێمی دەریـای ناوەڕاسـت بەشـی باشـووری ڕۆژئـاوای ولایەتـە یەککرتوەکانی ئەمەریکا دەگرێتەوە، بە تایبەتی ولایەتی کالیفورنیا هـاوینی گەرم و وشکە، تێکڕای پلەی گەرمی زیاترە لە (٢٢°) پلەی سەدی، و زستانی ساردو باراناویە.

## ح- هەرێمی ئـاووهەوای وشك و نیمچە وشك:-

هەرێمی وشك (بیابـان) ناوچـەی بانـەکان و ئاوزێلـەکانی نـاوەوەی بەشـی باشـووری ڕۆژئـاوای ولایەتـە یـەککرتوەکانی ئەمـەریکا دەگرێتـەوە و پلـەی گەرمی بەرزەو ، بڕی باران بارینی کەمە.

هـەرێمی نیمچـە وشـك بەشـی ڕۆژئـاوای دەشـتەکانی نـاوەوە دەگرێتـەوە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی چیاکانی ڕۆکی بارانی کەمترە لە هەرێمەکانی تر.

### ٤- گرنگترین رووبارو دەریاچەکانی کیشوەرەکە :-

ئەم کیشوەرە دەوڵەمەندە بەدەرامەتی ئاو. و لێرەدا تەنها ئاماژە بە ئاوی سەرزەوی دەکەین (ڕووبار – دەریاچە)کان.

### ڕووبارەکانی کیشوەرەکە :

کیشوەرەکە کۆمەڵە ڕووبارێکی جۆراوجۆری پیادا تێپەڕدەبێت لە ڕووی درێژیەوە. و پشت بەستن بە رێژگەی ڕووبارەکەن دابەش دەکرێن بۆ ئەم کۆمەلانەی خوارەوە:

### أ- ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە زەریایی ئەتڵەسی :-

وەك ١- ڕووباری سانت لۆرانس

٢- ڕووبارەکانی ئەپەلاشیان کۆمەڵێ ڕووبار دەکرێتەوە کە لە بەرزاییەکانی ئەپەلاشیان هەڵدەقولێن و دەڕژێنە زەریای ئەتلەسی.

### ب- ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە زەریای بەستەڵەکی باکوور و کەنداوی هدسن :-

ئەم ڕووبارانە دەگرێتەوە (ڕووباری مەکنزی و ڕووباری سەسکجوان).

### جـ- ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە زەریای هێمن :-

ئەو ڕووبارانە دەگرێتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆن و دەڕژێنە زەریای هێمن، ئەم ڕووبارانە درێژنین و ئاوەڕۆیان خێرایە. گرنگترینیان ئەمانەن (ڕووباری یوکن – فریزر – کولۆمبیا– کولورادۆ –سان کینۆ ... هتد).

### د- ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە کەنداوی مەکسیك :

ئەو ڕووبارانە دەگرێتەوە کە بەرەو باشوور دەڕۆن و دەڕژێنە کەنداوی مەکسیك گرنگترینیان ڕووباری ریوگراندو میسیسیپی.

### دووەم / دەریاچەکان:

لەسەرڕووی کیشوەری ئەمەریکای ئەنگلوسەکسۆنی ژمارەکی زۆر دەریاچەهەن، گرنگترینیان ئەو دەریاچەیە کە بە دەریاچە مەزنەکان ناسراوە:

### أ- دەریاچە مەزنەکان:

دەریاچە مەزنەکان لە بنەڕەتدا لە (٦) دەریاچە پێك هاتووە ئەم دەریاچانە بە گەورەترین خەزانی ئاو دادەنرێن لە جیهاندا. ڕووبەرەکەی نزیکەی **(٢٤٦)** هەزار کیلۆمەتر چوارگۆشەیە. بە ڕێگەی ئاوەڕۆی دەستکرد، دەریاچەکان بەیەکەوە دەبەسترێنەوە، ڕووباری سانت لورنس ئاوی دەریاچەکان بە زەریای ئەتلەسی دەبەستێتەوە.

### ٥- ڕووەکی سروشتی:

جۆراوجۆری ڕووەکی سروشتی وە دابەشبوونی بەندە بە پلەی یەکەم بە جۆری ئاوو هەوا. بەم شێوەیە ڕووەکی سروشتی لە کیشوەرەکە بۆ ئەم هەرێمانەی خوارەوە دابەش دەبێت،

#### أ- هەرێمی گژوگیای تەندرا:

ئەم هەرێمە بەشی باکووری کیشوەرەکە دەگرێتەوە. گژوگیای ئەم هەرێمە کورتن و تەمەنیشیان کورتە، دوو تا سێ مانگ دەژین. بەناوبانگترینیان (قەوزە)یە.کە لەوەڕگایەکی باشەبۆ ئەو ئاسکانەی لەم هەرێمە دەژین.

#### ب- هەرێمی دارستانی سنۆبەری:-

ئەم هەرێمە دەکەوێتە باشووری هەرێمی تەندرا، بە پشتێنەیەکی فراوان لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، بە تایبەتی لە باشووری

ئەلاسکاوە بەرەو باکووری ناوەڕاستی کەنەدا. بە هەرێمێکی گرنگی دارستان دادەنرێت. بۆ مەبەستی بەرهەمهێنانی داری نەرم لە جیهاندا، کە لە ڕووی ئابوورییەوە گرنگی زۆرە.

### جـ- هەرێمی دارستانی تێکەڵاو:

ئەم هەرێمە لە دارستانی سنۆبەر، و دارستانی گەڵاوەریووەکان تێکەڵاوە دارستانی سنۆبەری بەشی باکووری ئەم هەرێمە دەگرێتەوە و دارستانی گەڵاوەریوەکان بەشی باشووری دادەپۆشێت. ئەم هەرێمە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەگرێتەوە.

### د- هەرێمی دارستانی گەڵاوەریوەکان: داری ڕەق -:

دارستانەکانی ئەم هەرێمە دارەکانی گەڵایان پانە و داری ڕەقن و گەڵا هەڵوەریوون، دەکەوێتە باشووری هەرێمی دارستانی تێکەڵاو. ئەم جۆرە دارستانە لە بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا هەیە.

### هـ- هەرێمی دارستانی ڕۆژئاوای کیشوەرەکان:

بەباشترین جۆری دارستان دادەنرێت لە ڕووی چڕی دارەکانی و جۆراوجۆری دارەکانی بەناوبانگترین داری ئەم دارستانە داری سورە، کە بەزەبەلاحی و بەرزی و باشی دارەکەی دەناسرێت.

### و- هەرێمی دارستانی دەریای ناوەڕاست:

دارەکانی ئەم دارستانە هەمیشە سەوزن و گەلایان پانە، لە جۆری دارو درەختی کورتن، و دەکەوێتە ولایەتی کالیفورنیا گرنگترین داری ئەم هەرێمە زەیتونە و باویە.

### ز- هەرێمی ڕووەکی گژوگیا:-

**ئەم هەرێمە دەکرێتە دوویەش:**

١- هەرێمی گژوگیای درێژ: کە دەشتەکانی ناوەڕاست دەگرێتەوە گژوگیاکەی لە جۆری بەراری درێژە.

٢- هەرێمی گژوگیای کورت: کە بەگژوگیای ستێپس دەناسرێت. ئەم هەرێمە، دەشتە مەزنەکان دەگرێتەوە.

### ح- هەرێمی ڕووەکی بیابان:

ئەم جۆرە ڕووەکە لە ولایەتەکانی باشووری ڕۆژئاوای ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بڵاون. پلەی گەرما بەرزە ڕێژەی بەهەڵمبوون بەرزە. لەگەڵ باران بارین ڕووەکی زۆری لێ شین دەبێت لە پاش نەمانی باران وشك دەبێت وەك ڕووەکەکانی بیانی موجاف.

## دووەم /دانیشتوان

کیشوەری ئەمەریکا ئەنگلوسەکسۆنی بە ناوچەی پێشوازی کردنی لێشاوەکانی ئادەمی جۆراوجۆر و یەك لە دوای یەك دادەنرێت. کە لە کیشوەرەکانی ئاسیاو ئەورووپا و ئەفریقیاوە هاتوون. لەگەل ئەوەش هیندیە سوورەکان بە دانیشتوانی ڕەسەنی کیشوەرەکە دادەنرێن. ئیسپانییەکان وەك کۆچبەری ئەورووپی بە یەکەمین کۆمەڵە دادەنرێت کە هاتوون بۆ کیشوەرەکە و لە کالیفورنیا و فلوریدا نیشتەجی بوون. لە پاشان

فەرەنسییەکان هاتوون لە پاشان بەریتانیەکان.. هتد. بەلاّم هاتنی ڕەش پێستەکانی ئەفریقی بە شێوەی بازرگانی کۆیلە هاتوونە کیشوەرەکە ژمارەی دانیشتوانی لە ساڵی ٢٠٠١، دەگاتە **(٣١٦)** ملیۆن کەس. زۆربەی هەرە زۆری دانیشتوان لە ولاّتی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەژین، کە ژمارەیان زیاترە لە **(٢٨٤)** ملیۆن کەسە، وە نزیکەی **(٣٢)** ملیۆن کەس لە ولاّتی کەنەدا دەژین.

لە ڕووی دابەش بوونی دانیشتوانەوە نارێکییەکی بەرچاو هەیە لە کیشوەرەکە، بەگشتی چڕی دانیشتوانی کیشوەرەکە کەمە (٢٦ کەس/ کیلۆ مەتر چوارگۆشەیە). ئەویش بۆ ئەم هۆکارانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە:-

١- درەنگ ئاوەدان کردنەوەی کیشوەرەکە.

٢- دانانی کۆسپ و بەربەست بۆ کۆچبەران.

٣- جێبەجێ کردنی شێوازی کەمی منداڵبوون ( تحدید النسل).

ڕێژەی زیاد بوونی ساڵانەی دانیشتوان لە کیشوەرەکە زۆر نزمە ڕێژەکە دەگاتە **(٠,٥ ٪)**. و زۆربەی دانیشتوانی کیشوەرەکە لە شارەکان دەژین و، ڕێژەیان دەگاتە( ٧٥٪ ).

## سێیەم/ چالاکییە ئابوورییەکان

### أ- کشتوکاڵ:

لە ڕووی کشتوکاڵییەوە ولاّتانی کیشوەرەکە پێش کەوتوون، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە گرنگترینیان ئەمانەن:-

١- فراوانی زەوی کشتوکاڵی.

٢- گرنگیدان بە کشتوکاڵ بۆ مەبەستی بازرگانی.

٣- گونجانی باری ئاوو هەوا.

٤- بەکار هێنانی ئامێری کشتوکاڵی، و تەکنەلۆژیای نوێ لەبەرهەمهێناندا.

و پەیڕەوکردنی لایەنی زانستی کشتوکاڵی بەرپرسە لە پێشکەوتنی وڵاتانی کیشوەرەکە لەم بوارە. سەرەڕای بەکارهێنانی ئامێری کشتوکاڵی پێشکەوتوو، بەکارهێنانی پەینی کیمیایی بەشێوەی زانستیانە... هتد.

گرنگترین بەرووبوومی کشتوکاڵی لە کیشوەرەکە (گەنم)ە، لەپاشان (گەنمە شامی، برنج، لۆکە، توتن.... هتد). وە بە هەمان شێوە لەڕووی بەخێوکردنی ئاژەڵەوە ئەم کیشوەرەئاژەڵی زۆرە.

## ب- پیشەسازی:

لە ڕووی پیشەسازییەوە، وڵاتانی ئەم کیشوەرە کە پێشکەوتوون، بەرووبوومە پیشەسازییەکانی لە زۆربەی بازارەکانی جیهاندا بەدی دەکرێن. وا مەزندە دەکرێت کە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و کەنەدا سێ یەکی بەرووبوومی پیشەسازی جیهانی بەرهەم بهێنن. ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان (زۆری کەرەستەی خاوی ڕووەکی - ئاژەڵی - کانزایی) و زۆری دەرامەت و سەرمایە(رؤوس الاموال)، و زۆری جۆرەکانی وزە (خەڵووز- نەوت - غازی سروشتی - وزەی ئاو ... هتد).

**گرنگترین پیشەسازیەکان:**

لە کیشوەری ئەنگلۆسەکسۆنیدا دوو جۆرە پیشەسازی هەن:

١- پیشەسازی دەرهێنان (کە بریتیە لە دەرهێنانی نەوت - گازی سروشتی - کانزای مس ... هتد)

٢- پیشەسازی گۆڕین (بەرهەم هێنانی ئامێرە کارەباییەکان، ئاسن و پۆلا - ئۆتۆمبێل ... هتد)

# بەندی پێنجەم

## کیشوەری ئەمەریکای لاتینی ( باشوور )




نەخشەی( ٣٨ )

بەرزی ونزمی رووی زەوی کیشوەری ئەمریکای باشوور

زاراوەی ئەمەریکای لاتینی مەکسیك و، ولآتانی ئەمەریکای ناوەڕاست و ولآتەکانی دەریای کاریبی و ئەمەریکای باشوور دەگرێتەوە.

## یەکەم/ جوگرافیای سروشتی :-

### ١- شوێنی جوگرافی :

ئەمەریکای لاتینی لە سێ لاوە بە ئاوی زەریای و دەریاکان دەور دراوە. کەنداوی مەکسیك و سنووری نێو دەوڵەتی ولآتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا ومەکسیك سنووری باکووری کیشوەرەکە پێك دەهێنن، و زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە رۆژ هەلآتی کیشوەرەکە، وزەریای هێمن دەکەوێتەرۆژئاوای کیشوەرەکە.

لە ڕووی ئەسترۆنۆمی، ئەمەریکای لاتینی دەکەوێتە نێوان بازنەی پانی (٣٢°) باکووری گۆی زەوی، بازنەی پانی (٥٦°)ی باشووری گۆی زەوی. ڕووبەری کیشوەرەکە زیاترە لە ٢٠ ملیون کیلۆمەتری چوارگۆشە، و ژمارەی دانیشتوانی کیشوەرەکە لە ساڵی **٢٠٠١**، نزیکەی **(٥٢٥)** ملیۆن کەسە.

### ٢- بەرزی و نزمی ڕووی زەوی :

بەرزی و نزمی ئەم دیاردانە دەگرێتەوە:-

#### أ- شاخەکان:

زنجیرە چیاکان بە گرنگترین ڕواڵەتی بەرزی و نزمی دادەنرێن. بەرزاییەکانی (ئەندێز) گرنگترینیانە، بە یەکێك لە درێژترین زنجیرە چیاکانی جیهان دەژمێردرێت، لە کەنارەکانی دەریای کاریبییەوە دەست پێدەکات درێژ دەبێتەوە بەرەو باشووری کیشوەرەکە، بەم شێوە درێژیەکەی دەگاتە

نزیکـەی (٦٤٠٠) کیلۆمـەتر، فـراوانترین شـوێنی زنجیرەکـە نزیکـەی (٨٠٠) کیلۆمەترە لە بەشی ناوەڕاستی، و جگە لەم زنجیرەیە چەندین زنجیرە چیای تر هەن لە مەکسیك و وڵاتانی ئەمەریکای ناوەڕاست.

### ب- بانەکان:

ڕووی زەوی کیشـوەرەکە چـەندین بـانی تێدایـە، بەشـی هـەرە زۆریـان دەکەونە ڕۆژهـەڵاتی کیشـوەرەکە، بـەناوبانگترو کۆنترینیـان بـانی بەڕازیلـە، بێجگە لەم بانە چەندین بانی تر هەن لە کیشوەرەکە وەك بـانی (مەکسـیك)، وە بانی غیانا، و بانی بەتەگۆنیا لە ئەرجەنتین.

### جـ- دەشتاییەکان:

گـرنگترین و فـراوانترین دەشـتەکانی ئـەم کیشـوەرە کەوتوونەتـە نێـوان بەرزاییەکانی ئەنـدیز لـەڕۆژئاوا، وبانـەکانی (غیانـا - بـەرازیل -بەتـەگونیا)، گرنگترین ئەو دەشتانە لە باکوورەوە بەرەو باشـووری کیشـوەرەکە ئەمانـەن (دەشتی ئورینکۆ ، دەشتی ئەمەزۆن ، دەشتی پارانا ، پاراگوای).

## ٣ - ئاوو هەوای کیشوەرەکە :

هەرێمەکانی ئاوهەوای کیشوەرەکە دابەش دەکرێ بۆ:

### أ- هەرێمی ئاوو هەوای یەکسان:

ئەم هەرێمە دەشتی ئەمازۆن دەگرێتەوە، پلەی گـەرما لـەم هەرێمـەدا بـە درێژایی ساڵ بەرزە، و تێکڕای بارانی ساڵانە دەگاتە (٢٠٠٠) ملم.

**ب- هەرێمی ئاوو هەوای خولگەیی دەریایی:**

کەنارەکانی ڕۆژهەلاتی کیشوەرەکە دەگرێتەوە، تێکڕای پلەی گەرمی ساڵانە (٢١°) پلەی سەدی کەمتر نییە، هەرێمێکی شێدارو باراناوییە، بە درێژایی ساڵ.

**ج- هەرێمی ئاوو هەوای (مامناوەندی)ی شێدار:**

ئەم هەرێمە ناوچە بەرزاییەکانی ناوچە خولگەیی دەگرێتەوە، هۆکاری بەرزی ڕووی زەوی لە دابەزینی پلەی گەرمی بەرپرسە، بەلام ئەو ناوچانەی کە نزمن پلەی گەرمیان بەرزە، لە ڕووی بارانیشەوە بڕی بارانی ئەم هەرێمە لە نێوان **(٧٥٠ - ١٦٥٠)** ملم لە ساڵێکدا، ئەم هەرێمە بانەکانی غیاناو بەشی باشووری بانی بەرازیل دەگرێتەوە.

**د- هەرێمی ئاوو هەوای سافانا:**

دەشتی لانۆس و زۆربەی بانی بەرازیل و کەنارەکانی ڕۆژئاوای ئەمەریکای ناوەڕاست (باشووری خولگەی قرژاڵ) دەگرێتەوە، ئەم هەرێمە بارانی هاوینەیە و زستانی وشکە، تێکڕای گەرمی ساڵانە دەگاتە نزیکەی **(٢١°)** پلەی سەدی، و بڕی باران بارینی ساڵانە لە نێوان **(٦٠٠ - ١٠٠٠)** ملم ە.

**هـ- هەرێمی ئاوو هەوای مام ناوەندی شێدار:**

ئەم هەرێمە هاوینی و زستانی لە ڕووی پلەی گەرماوە، مام ناوەندییە سەرەڕای ئەویش پلەی گەرمی لە هاویندا مەیلی بەرزبوونەوەی هەیە، بە تایبەتی لە بەشی باشووری بەرازیل، و بڕی باران بارین لەم هەرێمەدا لە **(٧٥٠)**ملم کەمتر نییە، تیایدا باران لە هاوین دەبارێت.

### ١- هەرێمی ئاوو هەوای دەریای ناوەڕاست:

بەشـی ناوەڕاسـتی وڵاتـی شـیلی دەگرێـتەوە کـە دەکەوێتـە ڕۆژئـاوای کیشوەرەکە، زستانی باراناوییە و هاوینی وشکە.

### و- هەرێمی ئاوو هەوای ڕۆژئاوای کیشوەرەکە:

ئەم هەرێمە بەشی باشووری وڵاتی شیلی (باشـووری بازنـەی پـانی (٤٠°) باشوور) دەگرێتەوە، تێکڕای پلەی گـەرمی سـاڵانەی ئـەم هەرێمـە لـە نێـوان (٥ — ١٥°) پلـەی سـەدییە، و بـڕی بـاران بـارین سـاڵانە دا لـە (١٠٠٠) ملـم زیاترە.

### ز- هەرێمی ئاوو هەوای تەندراو بەرزاییەکانی ئەندێز:

هـەرێمی تـەنـدرا ڕووبـەرێکی بچـووك لـە کیشـوەرەکە دەگرێتـەوە، کـە دەکەونە ئەو پەڕی باشووری کیشوەرەکە لە باشووری بازنەی پانی (٥٠°) ی باشوور، وە بەشێك بەرزاییەکانی ئەندیز. تێکڕای پلەی گەرمی وەرزی گـەرما مانگی پلەی گەرمی لە (١٠°) پلەی سەدی تێپەڕ ناکات، بڕی باران بارین لـەم هەرێمەدا کەمە، ساڵانە لە (٢٥٠) ملم تێپەڕناکات.

### ی- هەرێمی ئاوو هەوا وشك و نیمچە وشك:

ئاوو هەوای وشك (بیابان) بەشی باکووری ڕۆژئـاوای مەکسـیك و بـاکووری بـانی مەکسـیك و بـاکووری شـیلی و باشـووری وڵاتـی پـیرۆ (بیابـانی پـیرۆ و بیابانی ئەتاگاما) لە شیلی دەگرێتـەوە، ناوەنـدی بـاران بـارینی سـاڵانەی لـە (٤٢٥) ملم کەمترە، پلەی گەرمی لە نێوان ١٥ — ٢١° پلەی سەدییە.

هـەرێمی ئاووهـەوای نیمچـە وشـك ( سـهوب) بـە شـێوەیەكی شـریتی تەسـك کەنارەکانی فەنزویلا و، شانی بەرازیل، و بانی بەتـەگۆنیا دەگرێتـەوە. وبـڕی باران بارین لە هەرێمەکەدا سالآنە لە نێوان (٢٥٠– ٦٥٠) ملم.

### ٤- ڕوبـارو دەریـاچەکـان:

#### یەکەم/ ڕووبـارەکان:

مەزنترین هێڵی دابەشبوونی ئـاو لـە کیشـوەرەکە بـە لوتکـەکانی زنجیرە شاخەکانی ئەندیز و چیا باس و سیرامادرای ڕۆژئاوا تێپەڕ دەبێـت. دەتـوانین ڕووبارەکانی کیشوەرەکە بکەین بە سێ بەشەوە.

#### ١– ئەو ڕووبـارانەی بەرەو ڕۆژهەلآت دەڕۆن و دەڕژێنە زەریـای ئەتلەسی:-

ئەمانە کۆمەڵە ڕووباری گەورەو بە ئاون بەناوبانگترینیان ئەمانەن:

##### أ– ڕووباری ئەمازۆن:

دووەم ڕوباری جیهانە لە درێژی، درێژیەکەی (٦٥٢٠)کم.

##### ب– ڕووباری پارانا – پاراگوای:

##### ج– ڕووباری ئۆرنیکۆ

#### ٢- ئەو ڕووبـارانەی دەڕژێنە زەریـای هێمن:

ئەم کۆمەڵە ڕووبارە دەکەونە بەشی ڕۆژئـاوای کیشـوەرەکە، کـە دەشـتە کەناریەکانی ڕۆژئاوا دەبڕن و دەڕژێنە زەریـای هـێمن، ئـەم کۆمەڵـە ڕووبـارە کـورت و خێـران و هەنـدێکیان وەرزییـە، گرنگترینیـان، ڕووبـاری گرانـددی سانتیاگۆ، و ڕووباری بالساس لە مەکسیك.

#### ٣ – ئەو ڕووبـارانەی دەڕژێنە دەریـایی کاریبی:

ئەو ڕووبارانە دەگرێتەوەکە دەڕژێنە دەریای کاریبی، ڕووبارەکان کورتن و درێژییان لە نێوان (١٥٠ – ١٥٠٠) کم، گرنگترینیان ڕووباری ( سـاند جـوان –

ئوتراتـۆ – ماگـدالینا ) یـە.ڕووبارەکـان لـە زنجـیرە چـیاکانی ئەنـدیز وە هەڵدەقوڵێن.

**دووەم/ دەریاچەکان:**

لەسـەر ڕوی کیشـوەرەکە چـەندین دەریاچـە دەبینـرێن کـە گرنگترینیـان ئەمانەن:

١- دەریاچەی ماراکیبۆ

٢- دەریاچەی تیتی کاکا

٣- دەریاچەی دی پوپو

**٥- ڕووەکی سروشتی:**

ڕووەکی سروشتی لە کیشـوەرەکە دابـەش دەکرێـت بـۆ ئـەم هەرێمانـەی خوارەوە.

**١- هەرێمی دارستـانی خولگەیی بارانـاوی ( دارستانی سلڤا:**

دارستانەکانی ئەم هەرێمە ڕووبەرێکی فراوان لـە کیشـوەرەکە دادەپۆشـن دارەکانی بە درێژایی سـاڵ سـەوزن و چـڕییان زۆرە، گـەڵایان پـانن و جـۆراو جۆرن و بەرزن، ئەمـەش بـۆ بـەرزی پلـەی گـەرما و بـارانی زۆر دەگەڕێتـەوە (ئـاوو هـەوای یەکسـانی)، ئـەم دارسـتانە ئـاوزێڵی ئـەمازۆن و کـەنارەکانی ڕۆژهەڵاتی کیشوەرەکە لە نێوان بازنـەی پـانی ($20^\circ$) ی بـاکوور تـا ($30^\circ$) ی باشوور و کـەنارەکانی ڕۆژئـاوای کیشـوەرەکەی داپۆشـیوە، داری (لاسـتیك، کاکاو، عاج، مۆز، دار خورما) گرنگترین داری ئەم هەرێمەن.

**٢- هەرێمی دارستـانی وەرزی:**

ئەم دارستانە زۆربەی دورگەکانی هینـدی ڕۆژئـاواو کـەناری پاسـفیکی لـە ئەمەریکای ناوەڕاست، و باشووری ڕۆژهەڵاتی بەڕازیل و ڕۆژهەڵاتی پـاراگوای

دادەپۆشێت، بەڵام دارەکانی ئەم هەرێمە کورتن و جۆراوجۆریشیان کەمترە بە بەراورد کردن لەگەڵ دارەکانی هەرێمی یەکەم.

### ٣- هەرێمی دارستانی دڕکاوی:

دارستانەکانی ئەم هەرێمە ناوچە خولگەییەکانی کیشوەرەکە دەگرێتەوە، کە هاوینیان وشك و درێژە دارستانەکان لەم شوێنەدا بڵاون (باکووری ڕۆژهەڵاتی بەڕازیل و دەشتی جاکۆو باشووری ڕۆژئاوای مەکسیك و هەندێ ناوچەی تر لە ئەمەریکای ناوەڕاست ( کوباو جامایکا) دەگرێتەوە، دارەکانی ئەم هەرێمە بریتیە لە دارو درەختی دڕکاوی کورت، کە بەرهەڵستی وشکی دەکەن، لە هەندێ شوێن لەگەڵ ڕووەکی گژوگیای بەرز تێکەڵ دەبن.

### ٤- هەرێمی دارستانی تێکەڵ:

دارستانی ئەم هەرێمە تێکەڵە لە داری هەمیشە سەوز و گەڵای پان، لەگەڵ داری گەڵا هەڵوەریوەکان لە لایەك و داری سنەوبەر لە لایەکی تر، ئەم جۆرە دارستانەش لە بەشی باشووری بانی بەڕازیل تا وڵاتی ئۆرۆگوای درێژ دەبنەوە.

### ٥- هەرێمی دارستانی مام ناوەندی باراناوی:

ئەم دارستانە لە وڵاتی شیلییەوە لەگەڵ کەنارەکانی ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە لە نێوان بازنەی پانی (٤٠° – ٥٤°)ی باشوور، دارەکانی ئەم هەرێمە بە درێژایی ساڵ هەمیشە سەوزن.

### ٦- هەرێمی دارستانی دەریای ناوەڕاست:

دارەکانی ئەم هەرێمە بە درێژایی ساڵ سەوزن و گەڵاکانیان پانە، لە ناوەڕاستی وڵاتی شیلی دەبینرێن.

### ٧- هەرێمی گژوگیای خولگەیی:

بە هەرێمی (ساڤانا) دەناسرێت، و دوو جۆری هەیە ساڤانای وشك و ساڤانای شێدار، جۆری یەکەم بەشی زۆربەی رووی بانی بەرازیلی داپۆشیوە، بەڵام جۆری دووەم ئاوزێڵی رووباری ئۆرینکۆ، و بەشی باشووری رۆژئاوای بەرازیل، بەشێك لە پاراگوای داپۆشیوە، ئەم هەرێمە لە بەرازیل بە (کامبوس) دەناسرێت، و لە ئاوزێڵی ئۆرینکۆ بە (لانۆس) دەناسرێت.

### ٨- هەرێمی گژوگیای مام ناوەندی:

گژوگیای ئەم هەرێمە نەرمن، لەو شوێنانەدا دەروێن کە هاوینی گەرمەو زستانی (مامناوەندی)، بە هەرێمە (پەمپاس) دەناسرێت، لە دەوروبەری پایتەختی ئەرجەنتین (بۆینس ئایرس) دادەپۆشێت، رووبەرەکەی نزیکەی نیو ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە دەخەملێنرێت.

### ٩- هەرێمی گژوگیای ئەستەبس و رووەکی بیابان:

گژوگیای ئەستێپس لە بانی بەتەگونیاو باکووری رۆژئاوای ئەرجەنتین و کەنارەکانی فەنزویلاو هەندێ ناوچەی تری جیا جیا دەروێت، گژوگیای ئەستێپس کورتن، بەڵام رووکی بیابان لە باکووری رۆژئاوای مەکسیك و باکووری بانی مەکسیك و کەناری زەریای هێمن لە کەنارەکانی پیرۆو باکووری شیلی دەروێن، لە نێوان بازنەی پانی (٦° – ٣٠°)ی باشوور.

## دووەم/ دانیشتوانی کیشوەری ئەمەریکای لاتینی:

دانیشتوانی بنەڕەتی کیشوەرەکە هیندە سوورەکانن، کە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە هاتوون بۆ کیشوەرەکە، لە پاشان رەگەزەکانی تر روویان تێ کردووە، دانیشتوانەکەی لە وڵاتی بەرازیل دادەنیشن کە **(١٧٢)** ملیۆن کەسە، لە پاشان وڵاتی مەکسیك دێت، کە ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی **(١٠٠)** ملیۆن

کەسە، لە ساڵی ۲۰۰۱. تێکڕای گەشەکردنی ساڵانەی دانیشتوانی کیشوەرەکە بەرزە دەگاتە نزیکەی (٧,١٪).

لەڕووی دابەشبوونی دانیشتوانەوە نارێکییەکی بەرچاو هەیە لە کیشوەرەکە، ولەڕووی چڕی دانیشتوانەوە، چڕی دانیشتوانی لە کیشوەرەکە دەگاتە نزیکەی (٤١ کەس / کم٢ ). زۆربەی دانیشتوانی کیشوەرەکە لە شارەکان دەژین، و ڕێژەی شارنشین لە کیشوەرەکە(٧٤٪)یە لە ساڵی ۲۰۰۱.

## سێیەم/ چالاکی ئابووری:

کیشوەری ئەمەریکای لاتینی دەوڵەمەندە بە دەرامەتی سروشتی و ئابووری، وەك بوونی بڕێکی زۆر لە سەرچاوەکانی وزە (نەوت، گازی سروشتی، وزەی کارەباو..... هتد).

**چالاکییە ئابوورییەکانیش ئەمانەن:-**

### أ- کشتوکاڵ:

لە ڕووی کشتوکاڵەوە وڵاتانی کیشوەرەبە گشتی دواکەوتوون، سەرەڕای بوونی چەند هەرێمی پێشکەوتوو وەك هەرێمی پەمپاس لە ئەرجەنتین، لەگەڵ ئەوەش ڕێژەیەکی زۆر لە دانیشتوانی وڵاتانی ئەم کیشوەرە خەریکی کشتوکاڵن (پاراگوای، پۆلیڤیا، هایتی، گوانیمالا...... هتد)، وە تا ڕادەیەکی زۆر ئابووری ئەم وڵاتانە پشت بە داهاتی کشتوکاڵی دەبەستن، بە هەردوو لایەنیەوە (ڕووەکی – ئاژەڵی)، بەم شێوەیە بەروبوومە کشتوکاڵیەکان ڕێژەیەکی زۆر پێك دەهێنن لە داهاتی ناردنە دەرەوەی بەروبووم و کەلوپەل بۆ دەرەوەی وڵاتەکانیان، گرنگترین ئەم بەروبوومانەی کە دەنێردرێنە

دەرەوە ئەمانەن (گەنم، دەرە (گەنمە شامی)، مۆز، قامیشی شەکر، لۆکە و قاوە ...... هتد).

## ب - پیشەسازی:

لە ڕووی پیشەسازییەوە وڵاتانی کیشوەرەکە لە وڵاتانی گەشەکردوو دەژمێردرێن، لەگەڵ ئەوەش جیاوازیەکی بەرچاو هەیە لە ژمارەو جۆری پیشەسازیەکان لە نێوان وڵاتانی کیشوەرەکە، زۆربەی ئەم پیشەسازیانە هەن پیشەسازی دەرهێنانن (استخراجی)، پیشەسازی سوکن و پیشەسازی گۆڕینە، کە تا ڕادەیەك پێداویستی ژیانی ڕۆژانە دابین دەکەن بۆ ئەو بازاڕە گەورانەی هەن، لە ئەنجامی زۆری ژمارەی دانیشتوانی شارەکان، بوونی ئەو پیشەسازییانە تا ڕادەیەکی زۆر بە بوونی کەرەستەی خاو گرێدراوە، چونکە کیشوەرەکە دەوڵەمەندە بە جۆراوجۆری کەرەسەی خاوی کانزایی و ڕووەکی و ئاژەڵ، سەرباری فراوان بوونی بازاڕەکان و بوونی سەرچاوەی وزەی جۆراو جۆر، وە گرنگترین کەرەستە خاوەکان (نەوت،، گازی سروشتی، ئاسن، قامیشی شەکر و لۆکە و بەرووبوومی ئاژەڵی.....هتد).

# ئوسترالیا




نەخشەی کیشوەری ئوسترالیا

# بەندی شەشەم
# کیشوەری ئوسترالیا

کیشوەری ئوسترالیا بچوکترین کیشوەری جیهانە، بە تەواوی کەوتۆتە نیوەی باشووری زەوی، رووبەرکەی دەگاتە ٧,٦ ملیۆن کم٢، لە هەموو لایەك بە ئاو دەورە دراوە زەریای هێمن لە رۆژهەلات و باکووری رۆژهەلات، زەریای هیندی لە رۆژئاواو باکووری رۆژئاوا.

لە رووی ئەسترۆنۆمی ئوسترالیا کەوتۆتە نێوان بازنەی پانی ١١ — ٤٤° باشوورەوە هێڵی درێژی ١١٢ — ١٥٣ رۆژهەلات. خولگەی کارژۆڵە بە ناوەراستی کیشوەرەکەدا تێپەر دەبێ، ماوەی نێوان بەشی باکوور و باشوور دەگاتە ٣٨٦٢کم. کیشوەری ئوسترالیا تا رادەیەك یەك پارچەی پێوە دیارە ئوسترالیا لە رووی ئیداریەوە دابەش دەکرێت بۆ:-

١- کەرتی باکوور.

٢- ئوسترالیای باشوور.

٣- ئوسترالیای رۆژئاوا.

٤- کوینزلاند.

٥- نیو ساوث ویلز.

٦- ڤیکتۆریا.

٧- تەسمانیا.

٨- کەرتی پایتەختی ئوسترالیا (کانبیرا).

## پێکهاتەکانی سەر ڕووی زەوی ( بەرزی و نزمی )

لـە ڕووی پێکهاتــەکانی ســەر ڕووی زەوی کیشــوەری ئوســترالیا دابــەش دەکرێت بۆ سێ بەش کە ئەمانەن:

### ١- بانی ڕۆژئاوا :

نزیکــەی ٤٥٪ ی ڕووبــەری ئەســترالیا داگیرکــردووە و دەکەوێتــە بەشــی ڕۆژئاوای ئوسترالیا.

### ٢- دەشتەکانی ناوەڕاست (زەوییە نزمەکان ):

ئەم بەشە دەکەوێتە نێوان بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵات لەلایەك و بانی ڕۆژئـاوا لە لایەکی ترەوە.

### زەویە نزمەکانی ناوەڕاستی ئوسترالیا بۆ سێ بەش دابەشدەکرێت:

أ– حەوزی کەنداوی کەربنتاریا لە باکوور.

ب– حەوزی ئیرتوازی گەورە.

ج– حەوزی ڕووباری میری – دار لینگ.

سروشتی ئەم بەشەو پێکهاتە جیۆلۆجییەکەی وای کردووە ئەم بەشە زۆر دەوڵەمەند بێت به ئاوی ژێر زەوی و بیری ئیرتوازی.

### ٣- بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵات:

ئـەم بەشــە کەوتۆتــە ڕۆژهــەڵاتی ئوســترالیا، و نزیکــەی ١٤٪ی ڕووبــەری ئوسترالیا داگیر دەکات.

## ( ئاوو هەوای کیشوەری ئوستڕالیا )

## ( هەرێمەکانی ئاوو هەوا )

کیشوەری ئوسترالیا لە ڕووی ئاوو هەواوە بەسەر چەند هەرێمێکدا دابەش دەبێت، ئەم هەرێمانەش بریتین لە:

### ١- هەرێمی ئاوو هەوای دەریای ناوەڕاست:

بەشی باشووری ڕۆژئاوای ئوستڕالیاو بەشی باشووری ڕۆژهەڵاتی( ڕۆژئاوای ویلایەتی ڤیکتۆریا) دەگەرێتەوە، بە شێوەیەکی گشتی هەرێمێکی مامناوەندو خۆشە، بڕی بارانی ساڵانەی لە نێوان (٥٠٠ – ٧٥٠) ملیمتر و وەرزی داباریینی تیایدا دەکەوێتە زستان، بەڵام وەرزی هاوینی بە تەواوەتی وشکە.

تێکڕای پلەی گەرمی لەم هەرێمەدا دەگاتە (٢٢) پلەی سەدی لە وەرزی هاوین و (١٠) پلەی سەدی لە وەرزی زستاندا.

### ٢- هەرێمی ئاوو هەوای بیابانی:

پانتاییەکی زۆر گەورە لە کیشوەری ئوستڕالیا داگیر دەکات کە دەگاتە (٤٠٪)ی ڕووبەرەکەی ئەم هەرێمە بەوە ناسراوە کە پلەی گەرمی تیادا هەمیشە بەرزەو بارانی زۆر کەم لێ دەبارێ.

ئەم هەرێمە کەوتۆتە ناوەڕاستی کیشوەری ئوستڕالیا بەرەو بەشی ڕۆژئاوادا درێژ دەبێتەوە تا سەر کەنارەکانی زەریای هیندی، تێکڕای بارانی ساڵانە لەم هەرێمەدا لە (٢٥٠) ملیمتر کەمترە.

### ٣- هەرێمی ئاوو هەوای وەرزی:

ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی کوینزلاند دەگرێتەوە، پلەی گەرما بە درێژایی ساڵ بەرزە، تێکڕای پلەکانی گەرما لە نێوان (٢٥ – ٣٠°س) دایە، بارانی لە

وەرزی هاویندا دەبارێت سەرجەمی بارانی ساڵانە لەم هەرێمەدا زیاترە لە (١٥٠٠) ملیمتر، بەڵام هەرچەندی بەرەو ڕۆژئاوا بڕۆین ڕادەی بارانی ساڵانە بەرەو کەمی دەڕوات.

### ٣- هەرێمی ئاوو هەوای مام ناوەندی شێدار:

بەشی ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی نیو ساوث ویلز دەگرێتەوە تێکڕای پلەی گەرمای لە وەرزی زستاندا مامناوەندەو دەگاتە (١١°)س، بەڵام لە وەرزی هاویندا بەرز دەبێتەوە بۆ (٢٢°) س سەبارەت بە باران، بای بازرگانی باشووری ڕۆژهەڵات کە لەسەر زەریای هێمن هەڵدەکات بەرەو ئەو هەرێمە دێت و دەبێتە هۆی باران بارین بە درێژایی ساڵ.

### ٥- هەرێمی ئاوو هەوای خولگەیی نیمچە وشك:

لە شێوەی مانگێکی ناتەواو(هیلال) دەوری هەرێمی ئاوو هەوای بیابانی داوە لە باکوورو ڕۆژهەڵات و باشووردا، پلەکانی گەرما بە درێژایی ساڵ تا ڕادەیەك بەرزە بە شێوەیەك جیاوازی پلەکانی گەرمای نێوان هاوین و زستان لە نێوان (١٠ – ١٥°)س تێپەڕ ناکات، ڕادەی باران بارینی ساڵانەی دەگاتە (٣٠٠) ملیمتر.

## ( سامانی ئاو )

هەڵکەوتنی ئوسترالیا لە نێوان بازنەی پانی (١١ – ٤٤°) باشوورو نەبوونی زنجیرە چیای بەرز بۆتە مایەی کەمی رێژەی دابارین لە کیشوەرەکە بە شێوەیەکی گشتی، ئەگەرچی جۆرێ لە جیاوازی بەرچاو هەیە لە نێوان بەشە جیاجیاکانی کیشوەری ئوسترالیا، بۆ نموونە بە وردبوونەوەمان لە نەخشەی سروشتی کیشوەری ئوسترالیا کۆمەڵە رووبارێکی زۆر لە تەواوی ناوچە کەناریەکان بەدی دەکرێ، بەڵام رێژەی هەرە زۆری رووبارەکان، دوای وەرزی باران بارین پڕ ئاو دەبن و دوای ماوەیەکی کەم توشی وشکی دەبن، نمونەی ئەمەش وەکو رووباری فیتزۆری و ڤیکتۆریا لە باکووری ئوسترالیا و رووباری کلارنس و ریجموند لە رۆژهەڵاتی ئوسترالیا.

رووباری مێری – دار لینگ بە گرنگترین رووباری ئوسترالیا دادەنرێت کە رووبەری حەوزەکەی دەگاتە ٧٠٠ هەزار کم$^{٢}$، مێری – دار لینگ تاکە رووبارە کە بە درێژایی ساڵ ئاوی لێ نابڕێت و لەلایەن دانیشتوانەوە پشتی پێ دەبەسترێت بۆ کاروباری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری.

بێجگە لە ئاوی سەر زەوی کیشوەرەکە، ئوسترالیا چەند حەوزێکی ئاوی ژێر زەوی تیادایە، کە لە هەموویان گرنگتر حەوزی ئیرتوازی مەزنە، کە رووبەرەکەی دەگاتە زیاتر لە یەك ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە ئاوەکەی تا رادەیەك سوێرە، بۆ هەموو چالاکییەك دەست نادات و بەکاردەهێنرێت بۆ ئاودانی مەڕو ماڵات، ئەمەو (٢٠٪)ی مەڕو ماڵاتی ئوسترالیا بە ئاوی ژێر زەوی تێر دەکرێت.

## گەشەکردنی دانیشتوان لە ئوسترالیا و دابەش بوونیان:

ژمارەی دانیشتوانی ئوسترالیا لە ساڵی ٢٠٠٤ گەیشتە نزیکەی ٢٠ ملیۆن کەس، سپی پێستەکان لە ٩١٪ و زەرد پێستەکان (ئاسیاییەکان) ٧٪ی دانیشتوان پێك دێنن و. ئەو بارودۆخە دەرەنجامی دوو هۆکارن:-

١- دۆزینەوە و دەست بەسەرداگرتنی کیشوەرەکە لە لایەن بەریتانیاو نیشتەجێبوونی بەریتانیەکان بە تایبەتی و ئەوروپیەکان بەشێوەیەکی گشتی تیایدا.

٢- پەیڕەوکردنی سیاسەتی ئوسترالیای سپی، ئەویش بە دەرگە واڵا کردن لەبەردەم سپی پێستەکان و دانانی ئاستەنگ لەبەردەم کۆمەڵەکانی تر.

ئوسترالیا بەهۆی کەمی ژمارەی دانیشتوان و گەورەیی رووبەری چڕی دانیشتوانی نزمە، لەم بارەیەوە دەتوانین بڵێین چڕی دانیشتوان لەسەر ئاستی کیشوەرەکانی جیهاندا کەمترین چڕی تێدایە کە لە ٢,٦ کەس بۆ یەك کیلۆمەتر تێناپەڕێت، لە کاتێکدا چری دانیشتوان دەگاتە زیاتر لە (٧٠ ) کەس / کم٢ لە ئەورووپاو (٨٥ ) کەس/ کم٢ لە ئاسیا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ:-

١- زیاتر لە (٨٧٪)ی رووبەری ئوسترالیا پێکدێت لە ناوچەی بیابان و نیمچە بیابانی کە بارانی زۆر کەم لێ دەبارێت و پلەی گەرما بەرزە، کە ئەمەش یارمەتیدەر نییە بۆ نیشتەجێکردن و کۆچکردن بۆی.

٢- کۆسپ خستنە بەر کۆچکردن بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بە ڕەچەڵەك سپی پێست نین بۆ ئەم کیشوەرە.

## شارەکانی ئوسترالیا

گرنگترین شارەکانی ئوسترالیا ئەمانەن:

١- سدنی : گەورەترین شاری ئوسترالیایە، ژمارەی دانیشتوانی لە چوار ملیۆن کەس پترە.و بەندەرێکی گرنگە.

٢- ملبۆرن: دووەمین شاری ئوسترالیایە، ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی ٣,٥ ملیۆن کەسە.و بەندەرێکی گرنگی ئوسترالیایە.

٣- بریزبن و بیرس و ئۆلاید : سێ شاری گەورەی ئوسترالیایە.

٤- کانبیرا: هەرچەندە شارێکی بچوکە، بەلآم گرنگە چونکە پایتەختی یەکگرتووی ئوسترالیایە.

## چالاکی ئابووری ئوستڕالیا

بــارودۆخی ئوســتڕالیا لــە ڕووی چــالاکییە ئابووریەکانــەوە چــەند تایبەتمەندیــەکی هەیــە، لێــرەدا بــاس لــە گــرنگترین کەرتــە ئابووریــەکانی ئوستڕالیا دەکەین:-

### کشتوکاڵ:

سەرباری ئەوەی کە ئەو ڕووبەرەی بە کەڵکی کشتوکاڵی کردن دێت زۆر کەمەو ناگاتە (١٥٪)ی کیشوەری ئوســتڕالیا، بــەڵام زۆر ژیرانــە تــوانراوە ئــەو ڕووبەرە بە جۆرەها دانەوێڵە بچێنرێت و کەرتی کشتوکاڵی ڕۆڵی خۆی ببینێت لە بەرەو پێش بردنی وڵاتەکە هەر لــەم بــوارەوە ئوســتڕالیا پایەیــەکی دیــاری هەیە لــە نێــو وڵاتــانی جیهانــدا لــە ڕووی کشــتوکاڵیەوە، هــەروەها لــە ناردنــە دەرەوەی بەروبوومە کشتوکاڵیەکانی وەکو ((گەنم، گۆشت، دانەوێڵە، شەکر، خوری، بەرهەمەکانی شیر........ هتــد)). هــەروەها بەرهــەمی ئــاژەڵی پلــەی یەکــەمی هەیــە ڕێــژەی (٦٠٪) لــە بــەهای بەرهــەمی کشــتوکاڵی ئوســتڕالیا پێکدێنێ وە بەرهەمی ڕووەکی (٣٧٪) و پەلەوەر (٣٪).

### پیشەسازی:

بە هاونرخی بەرهەمی پیشەسازی لەپێش بەهاونرخی بەرهەمی کشتوکاڵی دێت، کەرتی پیشەسازی زۆر پێش کەوتووە، ئەو پێشکەوتنەش دەرەنجــامی بــەکارهێنانی ســەرمایەیە لــە کــەرتی پیشەســازی دا لــە لایــەن ســەرمایەدارە ئوسترالیەکان و بێگانەکان، لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٤ دا نزیکەی لــە (٢١٪) ی دەستی کارکردن لە پیشەسازی دا بوو.

**ئەم پێشکەوتنە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك لەوانە :-**

١- بوونی مادە سەرەتاییەکانی ڕووەکی و ئاژاڵ و کانزای پێویست بۆ پیشەسازی هەمەجۆرەکان بە ئاستێکی باش و لەبار.

٢- هەبوونی دەستی کاری کارامەو لێهاتوو و زانا.

٣- هەبوونی سەرمایەی زۆر (چ سەرمایەی خۆماڵی بێ یان بیانی).

٤- هەبوونی ووزەی پێویست، بە تایبەتیش ووزەی خەڵوز.

٥- شوێنی جوگرافی ئوستڕالیا، کە تاڕادەیەك شوێنێکی دوورە پەرێزە، ئەم شوێنە یارمەتی دەر بووە بۆ گەشەکردنی پێك هاتە جیاوازەکانی کەرتی پیشەسازی بۆ دابین کردنی پێویستە هەمە جۆرەکانی دانیشتوانی ئوستڕالیا دوور لە ڕکابەری بەرهەمە پیشەسازییەکان وڵاتی تری جیهان.

٦- ئاسانی ناردنە دەرەوەی بەرهەمە پیشەسازیەکانی ئوستڕالیا بۆ وڵاتانی کۆمنویلث کە ئوستڕالیا ئەندامە لەو کۆمەڵەیە.

بەندی یەکەم/ بانگەوازی ئیسلام و پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامی

بەندی دووەم/ خەلیفەکانی راشدین

بەندی سێیەم/ کوردستان لە سەردەمی پەیدابوونی ئیسلام و خەلافەتەکاندا

بەندی چوارەم/ سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی

بەندی پێنجەم/ سەردەمی دەوڵەتی عەباسی

# بەندی یەکەم

# بانگەوازی ئیسلام و پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامی

## پێگەی جوگرافیای نیمچەدوورگەی عەرەب:

نیمچە دوورگەی عەرەب دەکەوێتە لای باشووری خۆرئاوای کیشوەری ئاسیا، پێیدەوترێت (جەزیرە – دوورگە)، چونکە ئاوی دەریاکان لە سێ لاوە دەوری داوە: لە ڕۆژهەڵاتەوە کەنداوی و لە ڕۆژئاواوە دەریای سوورەو لە باشوورەوە دەریای عەرەب و ئۆقیانووس (زەریا)ی هیندی. هەرچی لە باکوورەوەیە، هاو سنوورە لەگەڵ وڵاتی شام و عێراق.

## پێگەی مەککە:

شاری مەککە هەر لە کۆنەوە پلەو پایەیەکی تایبەتی هەبووە بەو پێیەی کە شوێنی یەکەمین ماڵی خوایە کە کەعبەی پیرۆزەو پێغەمبەر ئیبراهیم (د.خ) بنیاتی ناوە، هەر لەو کاتەوە بە پیرۆز ڕاگیراوەو خەڵکان لە هەموو لایەکەوە بە مەبەستی حەجکردن ڕوویان تێکردووە.

لە لایەکی تریشەوە هەڵکەوتەی شارەکە وایە کە کەوتبووە سەر ڕێگەی بازرگانی، کاروانە بازرگانییەکان لە شامەوە بۆ یەمەن و بە پێچەوانەشەوە بە مەککەدا دەڕۆیشتن، بەمەش بوو بووە شارێکی بازرگانی.

لە قورئانی پیرۆزیش لە سورەتی (ئیلاف) ئاماژە بەوە کراوە.

## ژیانی محەمەد (د.خ) پێش پێغەمبەرایەتی

## ژیاننامەی پێغەمبەر (د.خ)

محەمەد (د.خ) سەر بە هۆزی (قورەیش) بووە لە بنەماڵەی (بەنو هاشم)ە.

محەمەد لەو ساڵەدا لەدایك بووە کە بە (ساڵی فیل) ناسرابوو، لەبەر ئەوەی لەم ساڵەدا حەبەشییەکان بە سەرکردایەتی (ئەبرەهە)و بەکارهێنانی ژمارەیەکی زۆر لە فیل، هێرشیان هێنایە سەر مەککە، بە مەبەستی داگیرکردنی و ڕووخاندنی کەعبەی پیرۆز، بەڵام سەرنەکەوتن، ئەم ڕووداوەش، لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێکراوەو سورەتێکی تەواو بەناوی سورەتی (فیل) باس لەم ڕووداوە دەکات. کەواتە محەمەد (د.خ) لەم ساڵە لەدایك بووە کە دەکاتە ٥٧١ ی زایینی.

محەمەد (د.خ) بە هەتیوی پێگەیشتووە، عەبدوڵڵای باوکی کۆچی دوایی کردووە کە هێشتا محەمەد (د.خ) لە سکی دایکی دا بووە، کە تەمەنی گەیشتە (٦) ساڵ ئامینەی دایکی کۆچی دوایی کرد. واتا هەر لە بچووکییەوە ئازاری بێ باوکی و بێ دایکی دیوە و دوور بووە لە سۆزو میهرەبانی دایك و باوك. لەبەر ئەوە (عبدالمطلب)ی باپیری محەمەد بردیە لای خۆی و سەرپەرشتی و پەروەردەکردنی گرتە ئەستۆی خۆی.

لە تەمەنی (٨) ساڵیدا موحەمەد باپیرشی کۆچی دوایی کرد، ئینجا ئەبوو تاڵیبی مامی بردیە لای خۆی و بەخێوی کرد، قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی کردووە، بە بێ باوکی و بێ دایکی محەمەد کە دەفەرموێت: ((ألم يجدك يتيما فأوى)) بێگومان ژیانێکی بەم شێوەیە وا دەکات کە مرۆڤ زیاتر هەست بە مانا مرۆڤایەتییە پاکەکان و سۆزو میهرەبانی و بەزەیی بەرامبەر بێ باوکان و

نەداران بکات، هەر بۆیەش پێغەمبەر (د.خ) هەستی بە ئازار و مەینەتی چینی هەژار و نەدار و بەلەنگازان دەکرد.

محەمەد (د.خ) چوار ساڵی یەکەمی منالّی خۆی لە بیابان بەسەربرد لە لای هۆزی (بەنی سەعد)، کە ئافرەتێك لەم هۆزە بەناوی (حەلیمەی سەعدیە) دایەنێتی دەکرد. ئەوەبوو بە پتەوی و لەش ساغی و زمان پاراوی و بە لێهاتوویی پێگەیشت، لە دەوروبەرێکی بیابانی ئاوا هێمن و بێگەرد دا، پێغەمبەر (د.خ)، توانست و بەهرەکانی چەکەرەیان کرد، بوو بەکەسێکی خاراوو خاکی.

## سیفەتەکانی پێغەمبەر (د.خ):

موحەمەد (د.خ) لە سەرەتای لاوێتی دا، شوانییەتی مەڕو ماڵاتی بۆ خەڵك لە مەککە بە کرێ دەکرد. لە فەرموودەیەکیش دا هاتووە کە پێغەمبەر فەرموویەتی: ((پێغەمبەر نەبووە مەڕو ماڵاتی بەخێو نەکرد بێت)). و لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا کاری بازرگانی بەکرێ بۆ ژنە بازرگانی شاری مەککە (خەدیجە کچی خوەیلید) کردووە، بەمەش چاوی زیاتر کراوەتەوەو بەڕووی بە کۆمەڵانی خەڵك و شێوەی گوزەران و گرفتەکانیان ئاشنا بووە، ئەمەش زۆر گرنگە بۆ کەسێك کە پەیامێکی ئاسمانی لە ئەستۆدا بێت و بیگەیەنێت بە خەڵکان.

**ژیری موحەمەد:** موحەمەد (د.خ) بەوە ناسراوە، کە خاوەن عەقڵێکی دروست و ڕاو بۆچوونی ڕەسەن بووە، نموونەش بۆ ئەوە زۆرن، وەکو ڕووداوی دانانەوەی (بەردە ڕەشەکە) لە شوێنی خۆی لە کەعبە. ئەوە بوو جارێکیان بەهۆی باران بارینی زۆرەوە، لە مەککە دیوارەکانی کەعبە دارمان، و خەڵکی مەککە بڕیاریان دا، کە بە تەواوی بیان ڕووخێنن و دووبارە سەر لە نوێ

دروستیان بکەنەوە، و دوای ئەوەی کە ئەم کارەیان بە ئەنجام گەیاند، ویستیان (بەردە ڕەشەکە)، کە پیرۆزیی خۆی هەیە لە شوێنی خۆی دابنێنەوە، بەڵام هەر هۆزەی دەیویست شەرەف و گەورەیی ئەم کارە بەوان ببڕێت، لەسەر ئەمەش ناکۆکییەکی توند کەوتە نێوانیان تا گەیشتە ڕادەی هەڕەشە کردن و چاو لەیەك سوورکردنەوە، دواجار بڕیاریان دا کە هەموو لایەك ڕازی دەبن بە ناوبژی ئەو کەسەی کە یەکەمجار لە دەرگای (بەنی شیبە) ەوە دێتە ناو کەعبە، خوا وای کرد کە ئەو کەسە پێغەمبەر بێت، کە چاویان پێی کەوت هەموویان دڵیان ئۆقرەی گرت و گوتیان ئەوە دەستی (ئەمین) هات بە بڕیاری ئەو ڕازین.

و کاتێك کە هەواڵی مەسەلەکەیان پێ ڕاگەیاند، ساتێك بیری کردەوە، ئینجا پۆشاکەکەی بەری لەسەر زەوی داناو بەردەڕەشەکەی لەسەر داناو داوای لێ کردن، کە هەر یەکەیان، چەمکێکی پۆشاکەکە بگرن و بەرزی بکەنەوە، تاوەکو گەیشتە ئاستی شوێنی بەردەکە، ئەو کاتە بە دەستی خۆی بەردەکەی لە شوێنی خۆی داناوە. بەم شێوەیە هەموو لایەك ڕازی بوون و هۆشمەندی پێغەمبەر ئاگری شەڕێکی تری دوور خستەوە لە هۆزە عەرەبەکان، کە پێشتر، لەبەر هۆکاری زۆر ساکارتر، شەڕی درێژخایەن لە نێوانیاندا هەڵدەگیرسا.

**چالاکی**

گرووپێك لە قوتابیان پەخشێکی سەر دیوار لەمەڕ ژیاننامەی پێغەمبەر (د. خ) ئامادە دەکەن.

**ڕاستگۆیی و دەستپاکی پێغەمبەر:** پێغەمبەر (د.خ) لە تەمەنی لاوێتیدا، بە (ڕاستگۆ و دەستپاك) ناسرابوو و لە نێوان خەڵكدا بە مامەڵەی ڕێك و ڕەفتار جوانی و بەجێ گەیاندنی بەڵێن و سەرجەم خوو ڕەوشتە بەرزەكان بەناوبانگ بوو. هەر ئەمەش وایكرد، كە خەدیجەی كچی خوەیلید داوای لێ بكات، كە ساڵانە كاری بازرگانی بۆ بكات، لەو كاروانەی كە دەینارد بۆ شاری (بوسرا)و لە بەرامبەردا كرێیەكی دوو ئەوەندەی پێ بدات كە دەیدا بە كەسێكی تر لە نزیكەكانی خۆی. لە گەشتی بازرگانی یەكەمیدا پێغەمبەر بە قازانجێكی زۆرەوە گەڕایەوە مەككە، وەبەهۆی دڵسۆزی و دەست پاكییەكەی خەدیجە كرێیەكەی بۆ كردە دوو ئەوەندەی كە پێشتر بەڵێنی پێدابوو. ئەم ئاكارە دروست و بەجێیانەی پێغەمبەرو ڕەوشتە بەرزەكەی هانی خەدیجەی دا كە حەز بكات مێردی پێ بكات.

پێش پێغەمبەرایەتی، بە چەند ساڵێكی كەم، خوای گەورە وای كردووە، كە حەز لە دەرچوون بكات بۆ ئەشكەوتی (حراء) كە چیایەكە دەكەوێتە لای باكووری خۆرئاوای شاری مەككەوە، لەوێدا هەر ساڵەی بۆ ماوەی مانگێك — كە مانگی ڕەمەزان بوو، دەمایەوەو بە تەنها بیری لە نیشانەكانی گەورەیی خوای پەروەردگارو دەسەڵاتە بێ سنوورەكەی لە دروست كردنی بوونەوەرو گەردوون دەكردەوە. لەسەر ئەم حاڵەش بەردەوام بوو، تاوەكو سروش (وەحی)ی لە لای خوا بۆ هات، سەرەتا ئایەتێكی لە قورئانی پیرۆز بۆ دابەزی.



## هاتنی سرووش ((الوحي)) بۆ پێغەمبەر (د.خ):

پێغەمبەر (د.خ) تەمەنی ((٤٠)) ساڵی تەواو کرد، پێی لە چل و یەك نابوو وەحی (سرووش) بۆ هات، ئەوەش لە دەوروبەری ساڵی ٦١٠ی زایینی بوو. لە سەرەتاوە خەونی دەبینی و خەونەکانیش وەك و ڕۆژی ڕووناك ڕاست دەردەچوون، و لەدوای ئەو خەونانەوە بە تەواوی دڵ و دەروونی وەك ئاوێنەی بێگەردی لێ هاتبوو، و یەکسەر ڕووی دڵی خۆی کردە خواو ڕێگە ڕاست، وە لەم کاتەدا زیاتر ئارەزووی تەنیایی و گۆشەگیری دەکرد. هەتا ڕۆژی دووشەممە لە ((١٧))ی ڕەمەزان لە ڕێکەوتی ٦/٨/٦١٠ز کتو پڕ کەسێکی لێ پەیدا بوو پێی وت ((محەمەد مژدەبێ تۆ بووی بە پێغەمبەری خودا بۆ سەر ئادەمیزادو منیش جبرائیلم))، هەر بۆیە زیاتر تەنهایی لا شیرین بوو دەچوو بەتەنها لە ئەشکەوتی (حراء) خوا پەرستی دەکرد، چەند شەوێك لەوێدا دەمایەوە تێشووی لەگەڵ خۆیدا دەبردوو. بەم شێوەیە ژیاوە هەتا فریشتەیەك هاتە لای و پێی وت: بخوێنەوە. وتی: من خوێندەوار نیم.

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرمووێ: گوشـیمی بەخۆیـەوە، تـاکو نارەحـەت بـووم و ئازارم پێ گەیی، پاشان بەری دام و وتی: بخوێنەوە. وتم: خوێندەوار نیم، بۆ جـاری دووەم، گوشـیمی بەخۆیـەوەو زۆرتـر ئـازارم پـێ گـەیی و بـەرەڵای کردمەوەو وتی: بخوێنەوە. منـیش دیسـان وتم ئـاخر خوێنـدەوار نـیم، و بـۆ جاری سێیەم، گوشـیمی بەخۆیـەوە، زیـاتر ئـازارم پێگـەیی و پاشـان بـەری دامەوەو وتی: بخوێنەوە ئینجـا ئـەم ئایەتـە پـیرۆزەی بـۆ خوێنـدەوە ((اقـرأ بأسم ربّك الذي خلق * خلق الانسان من علـق * اقـرأ وربّـك الآكـرم الـذي علـم بالقلم * علم الانسان مالم يعلم)) و پێغەمبەر (د.خ) دووبارەی کردەوە.

## بـانگەوازی ئیسلام

بانگـەوازی ئیسـلام لـە ژیـانی پێغەمبـەر دا (د.خ) هـەر لـە بـوونی بـە پێغەمبەر تاوەکو کۆچی دوایی بە دوو قۆناغدا تێپەڕیوە:

یەکەم/ قۆناغی یەکەم: بانگەوازی نهێنی، کـە مـاوەی سـێ ساڵی خایانـد لـە مەککە.

دووەم/ قۆنـاغی دووەم: بانگـەوازی بـە ئاشـکرا، کـە هـەتا کۆچـی دوایـی بەردەوام بوو.

### قۆنـاغی یەکەم: بـانگەوازی نهێنی:

پێغەمبەر (د.خ) دوای هاتنـە خـوارەوەی سـروش بـۆی و بـە فـەرمانی خوا، دەستی کرد بە بانگ کردنی خەڵك بۆ پەرستنی خودایەکی تـاك و تـەنیا کە (الله)یە، و وازهێنان لە بتپەرستی. ئەو کـارەش بـە نهێنـی بـوو لـە ترسـی کاردانەوەی خراپی قورەیشە بتپەرستەکان.

لەبەر ئـەوە پێغەمبـەر، لـە کۆبوونـەوە گشـتییەکانی قـورەیش، ئـەم باسـەی نەدەدرکانـد، بـەڵکو تـەنها ڕووی بانگـەوازی بـەرەو ئـەو کەسـانە بـوو کـە

پەیوەندی خزمایەتی نزیکیان لەگەڵ هەبوو یاخود ناسیاو و جێگەی بڕواو متمانە بوون. ئەو قۆناغەش لەدوای هاتنە خوارەوەی ئایەتی ((یا أیها المدثر، قم فأنذر ..... )) دەستی پێکرد.

یەکەم کەس کە باوەڕی بە پێغەمبەر هێناو هاتە ناو ئیسلام. خەدیجەی هاوسەری بوو، ئینجا (عەلی کوڕی ئەبو تالیب) ی ئامۆزای کە ئەوکات تەمەنی دە ساڵان بوو، ئینجا (زەیدی کوڕی حاریسە) و لەپاشان (ئەبو بەکری سدیق (ر، خ))، یەکەم کەس لە کۆیلەکان کە موسڵمان بوو، (بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی) بوو.

لە ماوەی سێ ساڵی بانگەوازی بە نهێنی، نزیکەی چل کەس لە ژنان و پیاوان باوەڕیان بە بانگەوازی پێغەمبەر هێنا. موسڵمانەکان لەم ماوەیەدا بە نهێنی، چاویان بە یەك دەکەوت و زۆرجار، لە ماڵی (ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم) بە نهێنی کۆدەبوونەوە، کە تیایدا پێغەمبەر (د.خ) ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی پێ ڕادەگەیاندن و * دوور لە چاوی بێ باوەڕو بتپەرستەکان ئامۆژگاری دەکردن ئەم شێوازە لە قۆناغی داهاتووش درێژەی هەبوو.

## قۆناغی دووەم: ئاشکراکردنی بانگەواز:

لەدوای سێ ساڵ لە بانگەوازی بە نهێنی، خوای گەورە، فەرمانی بە پێغەمبەر دا، لە ڕێگەی ناردنی (سروش)ەوە، بۆ ئاشکراکردنی بانگەوازەکەی و ڕوو بەڕوو بوونەوەی بێ باوەڕەکان و بتەکانیان، بە پێی ئایەتی ((فاصدع بما تؤمر وأعرض عن المشركين، انا كفيناك المستهزئين)) هەروەها ئایەتی: ((وأنذر عشيرتك الآقربين، واخفض جناحك لمن اتبعك من المؤمنين، فأن عصوك فقل أني برءي مما تعملون)) ئەم قۆناغە، سەرەتای ئەشکەنجەدانی پێغەمبەر (د.خ) و شوێن کەوتووانی بوو، چونکە بتپەرستەکانی قوڕەیش،

زۆر دڵگران و تــووڕە بــوون، کاتێك بینیــان کــە پێغەمبــەر، داوا دەکـات کـە خودایــەك بپەرســتن، کــە چــاوەکان نــایبینن ، بــەڵام ئــەو ئــەوان دەبینێــت و ئاگاداری هەموو شتێکە.

دوای ئــەوە، ئــازارو ئەشــکەنجەدانی بــێ باوەڕەکــان، لــە ئاســتی پێغەمبــەرو هاوەڵانی توند تر بوو، و جۆرەها ئەشکەنجەیان دەدا لە گــرتن و ڕاوەدوونــان و لێــدان و ســووکایەتی پێکــردن و داخ کــردن و زنجــیر کــردن و ڕاکێشــانیان لەسەر سك و بەرد خستنە سەر سك و پشتیان لە گەرمترین ساتەکانی ڕۆژانی هاوینی دا، بەڵام هــەموو ئــەو دژایــەتی کردنــە، موســوڵمانانی زیــاتر شــێلگیرو پەیگیر کرد لەسەر بەدڵسۆزی بۆ ئاینەکەیان.

## کۆچکردنی موسڵمانان

## کۆچکردن بۆ حەبەشە :

بەهۆی زیادبوونی بەردەوامی ئازارو مەینەتییەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر (د.خ) لەسەر دەستی بێ باوەڕەکانی شاری مەککە، پێغەمبەر لە مانگی ڕەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی، داوای لێکردن کە کۆچ بکەن بۆ وڵاتی حەبەشە، کە پادشاکەیان مەسیحی بوو پیاوێك بوو واناسرابوو کە کەس لای ئەو ستەمی لێ ناکرێت، بۆ ئەوەی لەوێ بمێننەوە تاوەکو خوای گەورە دەروویەکیان لێ دەکاتەوە. ئەوەبوو، سەرەتا (١٠) پیاوو (٤) ئافرەت، لە ڕێگەی دەریای سوورەوە دەچنە یەمەن، ئینجا لەوێوە بە سواری کەشتی بازرگانی دەپەڕنەوە بۆ حەبەشە، بە سواری دوو کەشتی بازرگانی کە بەرەو حەبەشە دەچوو بەڕێ کەوتن، هەرچەندە قورەیشییەکان ویستیان دەستیان پێیان بگات و بیانگێڕنەوە بەڵام بێ هوودە بوو.

دوای ئەوە ژمارەی کۆچکردووان زیادی کرد تا گەیشتە (٨٣) پیاوو (١٧) ئافرەت و چەندەها منداڵ.

نەجاشی پادشای حەبەشە، زوو ڕێزی لێنان و بەڵێنی پاراستن و حەوانەوەی پێدان، کە بەخۆشی و بە ئارامی لە وڵاتەکەی گوزەران ببەنە سەر. هەرچەندە بێ باوەڕەکانی قورەیش، هەوڵیان دا، کە قەناعەت بە نەجاشی بهێنن، ئەمەش لە ڕێگای وەفدێك بوو کە (عەمرو کوڕی عاص) سەرپەرشتی دەکرد، بۆ ئەوەی داڵدەی موسڵمانە کۆچکردووەکان نەدات و بیان گێڕێتەوە بۆ مەککە بەڵام هەوڵەکانیان بە ئاکام نەگەیشت.

ئەم کۆچکردنەی موسڵمانان بۆ حەبەشە، بە یەکەم کۆچکردن دادەنرێت لە مێژووی ئیسلامدا.

## دابڕینی گشتی :

کاتێـك هـەواڵی ڕێزلێنـانی نەجاشـی لـە موسـڵمانە کۆچـکردووەکان گەیشتە قورەیش، گەورە پیاوانی قورەیش، زۆر دڵگـران بـوون و بڕیاریـان دا ڕێگەیەکی تر بگرنە بەر بۆ ئـازاردانی پێغەمبـەرو شـوێن کـەوتووانی، ئـەویش بڕیاری پچڕینی هەموو جۆرە پەیوەندییـەکی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری لەگـەڵ (بـەنو هاشـم) و بـەرەبابی عەبـدول موتـەلیب. بـە پێـی ئـەو بڕیـارە کـە نووسـرایەوە و لـەناو کەعبـە هەڵواسـرا، تـاکو هـەموو لایـەك پابەنـد بـن بـە ناوەڕۆکەکەی، هەموو جۆرە مامەڵەیەك و کڕین و فرۆشتن و بازرگانی و قسە لەگـەڵ کـردن و تێکـەڵاوبوون و ژن و ژن خـوازی و پێکهـاتن و بـەزەیی پێـداهاتنێك قەدەغەیـە لەگـەڵ ئـەم دوو بەرەبابـە تـاوەکو محەمـەد دەدەن بەدەسـتەوەو دەکوژرێـت. ئـەوەبوو ئەنـدامانی ئـەم دوو بەرەبابـە بـە پیـاوو ئافرەت و منداڵیانەوە دوور خرانەوە بۆ دۆڵـەکانی ئـەبو تاڵیـب و ئابلۆقـەیان خرایە سەر.

ئەم دابڕینە، ماوەی دوو تا سێ ساڵی خایاند، لەم ماوەیەدا، موسـڵمانەکان و ئەو کەسانەی لە (بنو هاشـم) بـوون و هاوسـۆز بـوون لەگـەڵ موسـڵمانەکان، دەردو مەینـەتییێکی زۆریـان چێشـت، بـەڵام نـەبووە هـۆی لاوازکردنـی بیروباوەڕەکەیان.

**ڕاهێنان**

بۆچی قورەیشیەکان بەرهەڵستی (ئیسلامیان) کرد .....؟

## دەرچوونی پێغەمبەر (د.خ) بۆ شاری تائیف:

پێغەمبەر (د.خ) دوای ئەوەی کە بینی، ئیتر دانیشتوانی مەککە، ئەستەمە باوەڕی پێ بهێنن، بیری کردەوە کە بانگەوازەکەی بگوازێتەوە بۆ دەرەوەی مەککە، ئەوەبوو بە هاوڕێیەتی (زەیدی کوڕی حاریسە) بەرەو شاری تائیف ڕۆیشتن، بە ئومێدی ئەوەی کە هۆزی (سەقیف) باوەڕی پێ بێنێت، کە گەورەترین هۆزە نیشتەجێکانی ئەم شارە بوو. بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژ تیایدا مانەوە، کە داوای ئیسلام بوون و پاڵپشتیان لێکردن، بەڵام ئەوان بە گوێیان نەکردن کاردانەوەکی خراپیان نواند بەرامبەری، و داوایان لێکرد بە زووترین کات شارەکە جێ بهێڵێت، نەبادا کەسانێك لە لاوو تازە پێگەیشتووەکانیان بکەونە ژێر کاریگەری بانگەوازییەکەی. ئەوەبوو پێغەمبەریان بەدەرناو لە لایەن کەم عەقڵ و منداڵانەوە بەرد باران کرا کە بووە هۆی سەرشکانی زەیدو برینداربوونی قاچی پێغەمبەر (د.خ)، بەم شێوەیە ئەم هەوڵەی پێغەمبەر لە بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لە دەرەوەی مەککە سەری نەگرت.

## بانگهێشتکردنی هۆزە عەرەبییەکان بۆ بە ئیسلام بوون:

ئەمجارەیان پێغەمبەر (د.خ) بەباشی زانی، بانگەوازەکەی بە شاندی هۆزە عەرەبییەکانی دەرەوەی مەککە ڕابگەیەنێت، کە بە مەبەستی حەجکردنی ساڵانە، لە وەرزی حەج دا سەردانی مەککەیان دەکرد. و داوای لێکردن کە واز بێنن لە ئایینی باوك و باپیرانیان کە بتپەرستی بوو و تەنها خودایەکی تاك و تەنیا بپەرستن و هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن، هەروەها داوای پشتیوانی کردن و سەرخستنی لێکردن بەسەر قورەیشییە بتپەرستەکان، کە هەمیشە لە دوو ئازارو ئەشکەنجەدانی پێغەمبەرو شوێن کەوتووانی بوون.

هەرچـی هەڵوێسـتی شـاندی هـۆزە عەرەبیـەکان بـوو، ئـەوا جیـازواز بـوو، هەندێکیان بە شێوەیەکی رێك و شایستە پشتیان لە بانگەوازەکەی دەکردوو هەندێکیشیان بە شێوەیەکی نارێك و ناشیرین. هەندێکیشـیان باوەڕیـان پێـی هێناو دڵیان نـەرم بـوو. ئـەم دەسـتەیەش لـە دانیشـتووانی شـاری (مەدینـە) بوون.

لەو کاتەی کە پێغەمبەر لە (عەقەبە) بوو، چاوی بـە کۆمـەڵێك لـە کەسـایەتی سـەر بـە هـۆزی ئـەوس و خـەزرەجی دانیشـتووی (مەدینـە) کـەوت و داوای ئیسلام بوونی لێکردن، ئەوانیش ئیسـلام بـوون. کـە ژمارەیـان حـەوت کـەس بـوو. پـاش گەڕانـەوەیان بـۆ شـاری مەدینـە دەنـگ و باسـی پێغەمبـەرو پەیامەکەیان بۆ کەسو کارو نزیکەکانی خۆیان باسکرد.

## پە یمان ( گفت )ی یەکەمی عەقەبە ( ٦٢١ ) زایینی :-

لە ساڵی داهاتوو واتە: ساڵی دوازدەمـی پێغەمبەرایـەتی — لـە وەرزی حەجدا دوازدەکەس لە خەڵکی مەدینە، نۆیـان سـەر بـەهۆزی ئـەوس بـوون و سیانیشیان سەر بە خەزرەج بوون، بۆ حەج هاتبوون بۆ مەککـە، چـاویان بـە پێغەمبەر (د.خ) کەوت، لە گـەڵی کۆبوونـەوەو بـەڵێن و پـەیمانی پشـتگیریان پێدرا کە ناسراوە بە (گفت)ی یەکەمی عەقەبە.

پێغەمبەریش یەکێك لە هاوەڵانی خۆی کـە نـاوی (موصـعەبی کـوڕی عومـەر) بوو، لەگەڵیان نارد بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی فێری قورئانیان بکات و لە ئیسـلام شارەزایان بکات. ئەوەبوو ساڵ نەسووڕایەوە، کە ماڵ نەبوو لە مەدینە باسی ئیسلامی تێدا نەکرێت.

## ( گفت )ی دووەمی عەقەبە ( ٦٢٢ ) زایینی :-

لە ساڵی داهاتوو هەر لە وەرزی حەج، چەند کەسێك لە خەڵکی مەدینە کە تازە موسڵمان بوو بوون، هاتنە مەککە، ژمارەیان (٧٣) پیاو (٢) ئافرەت بوو لە هەردوو هۆزی ئەوس و خەزرەج. پێغەمبەر (د.خ) هەر لە (عەقەبە) لەگەڵیان کۆبۆوە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی بەسەردا خوێندەوەو هانی دان لەسەر باوەڕهێنانێکی دامەزراو بە ئیسلام، ئەوانیش بانگەوازییەکانیان پڕ بە دڵ وەرگرت و پەیمانیان پێ دا، کە بەرگری لێبکەن هەروەها پێشنیازیان کرد کە کۆچ بکات بۆ شارەکەیان وە بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە پێشوازی لێدەکەن. ئەم پەیمانەش بە گفتی عەقەبەی دووەم ناسراوە، کە ڕێ خۆشکەر بوو بۆ کۆچکردنی موسڵمانان بۆ شاری مەدینە. بێگومان ئەو دەستپێشخەرییەی کە نوێنەرانی ئەوس و خەزرەج نواندیان و ئیسلام بوونی خۆیان بە پێغەمبەر (د.خ) ڕاگەیاند و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی بۆ کۆچکردنی پێغەمبەر (د.خ) بووە هۆی بەرزکردنەوەی ورەی موسوڵمانان و هاندانیان بۆ کۆچکردن بۆ (یەثرب).

## کۆچکردن بۆ یەثریب ( مەدینە ):

کاتێك کە قوڕەیش بەمەی زانی کە کەسانێکی دانیشتووی یەثرب پەیمانی پشتگیریان بە پێغەمبەر داوەو باوەڕیان بە بانگەوازەکەی هێناوە، زۆر شڵەژان و ئازاردانی موسڵمانانیان زیاتر کرد. لەبەر ئەوە پێغەمبەر (د.خ) فەرمانی دا بە شوێنکەوتووانی، ڕێگەی یەثرب بگرنە بەرو کۆچ بکەن بۆ ئەم شارە، و پێی ڕاگەیاندن کە تیایدا ((خوای گەورە چەند برایەکی بۆ ئێوە پەیدا کردووەو شوێنێکیشی بۆ ڕەخساندوون کە تیایدا ئارام بن و بحەسێنەوە)).

لەسەر ئەم فەرمانە، موسڵمانان بە تاك و بە كۆمەڵ، دوای خـۆ ئامـادەكردن، بـە نهێنـی و دوور لـە چـاوی قـورەیش، هـەنگاویان نـا بـەرەو كۆچـكردن. موسڵمانان كۆمەڵ كۆمەڵ كۆچیان كرد تا وای لێهـات موسـڵمانێك لـە مەككـە نەمایەوە جگە لە پێغەمبەر (د.خ)و ئەبو بەكری صـدیق و عـەلی كـوڕی ئـەبی تاڵیب نەبێ.




## هەوڵدانی قورەیش بۆ لەناوبردنی پێغەمبەر (د.خ):

دوای ئـەوەی قورەیشـییەكانی مەككـە، دڵنیـا بـوون لـە باشـی و خۆشگوزەرانی موسـڵمانەكان لـە مەدینـە، گـەورە پیـاوان كۆبوونەوەیـەكیان گـرێ دا لـە (دارولنـەدوە = خانـەی كۆڕتیـاگرتن) بـۆ دەستنیشـان كردنـی ڕێگەچارەیەكی گونجاو بۆ لەناوبردنی خودی پێغەمبەر، ئەوە بوو بڕیاریان دا كە لە هەر هۆزێك لاوێكی بوێرو چاونەترس دیاری بكرێت و بە هەموویان بچنە سەر پێغەمبەرو لە شەوێكی تاریك دا بیكوژن و خوێنەكەشـی ون بێـت لـەنێو

هۆزەکان. تاکو بەرەبابی پێغەمبەر نەتوانن شەڕی تەواوی هۆزەکان بکەن و ناچاربن کە بە قەرەبوو (خوێن دان) ڕازی بن.
هەموو لاوە ڕاسپێردراوەکان بە کوشتنی پێغەمبەر خۆیان ئامادەکردو لە شەوی بڕیاردانی پێغەمبەر بۆ کۆچکردن، لەبەر دەرگای ماڵەکەی وەستان و چاوەڕێی دەرچوونیان دەکرد تا بیکوژن. ئەو شەوە پێغەمبەر لە جێگەی خۆی نەخەوتبوو بەڵکو داوای لە (عەلی کوڕی ئەبو تالیبی) ئامۆزای کردبوو لە جێگەی ئەو بخەوێت.
پێغەمبەر (د.خ) لە ماڵ دەرچوو بێ ئەوەی ئەو پیاوانە کە خۆیان بە کوشتنی مەلاس دابوو بیبینن، و بەرەو ماڵی (ئەبو بەکر) بەڕێ کەوت کە پێشتر دوو وڵاخی ئامادە کردبوو بۆ خۆی و پێغەمبەر (د.خ). ئەوە بوو لەماڵ دەرچوون بە دوو قوڵی و ڕێ نیشاندەرێك کە (ئەبو بەکر) بەکرێی گرتبوو بۆ ئەوەی ڕێی مەدینەیان نیشان بدات جیا لەو ڕێیەی کە زانراو بوو تاکو بێ باوەڕان بە ڕێگەکەیان نەزانن.
پێغەمبەرو (ئەبو بەکری) هاوڕێی سەر لەبەیانی ڕۆژی پێنج شەممەی یەکەمی مانگی ڕەبیعی یەکەم لە مەککە دەرچوون. ئەو کات تەمەنی پێغەمبەر (٥٣) پەنجاو سێ ساڵ بوو پاش چەندان ڕۆژ گەیشتنە یەثرب، کە خەڵکی ئەم شوێنە زۆر بە دڵگەرمی پێشوازیان لێکردن.

## کارە گرنگەکانی پێغەمبەر لە مەدینە :

هەر لەگەڵ گەیشتنی بۆ مەدینە، پێغەمبەر (د.خ) لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە لەم قۆناغە نوێیەی بانگەوازی بە ئەرکی پێویستی سەر شانی هەڵسێت کە ئامانجی ڕێکخستنی موسڵمانان و بونیادنانی دەوڵەتی ئیسلام بوو کە لەسەر بناغەی چەسپاو دامەزرێت و هەموو مەرج و پێداویستیەکانی ئەم ئامانجە فەراهەم بکرێت.

## گرنگترین ئەو بنچینانەی کە دەوڵەتی لەسەر دامەزراند، خۆیان لە چەند کارێکی سەرەکی دا دەدیتەوە کە ئەمانەن:

### یەکەم/ دروستکردنی مزگەوت:

پێغەمبەر لە ڕێگەی کۆچکردن بۆ مەدینە، کاتێك کە نزیك بوو لەم شارەو گەیشتە دێی (قوباء) کە دوو فەرسەخ لە مەدینەوە دوورە، لەوێدا لەگەڵ (ئەبو بەکر) لایان داو چوار ڕۆژ تیایدا مانەوە، سەرەتا مزگەوتێکی دروست کرد کە بە مزگەوتی (قوباء) ناسراوە.




دوای ئەوە درێژەی بە سەفەرەکەی دا تاکو گەیشتە مەدینە، یەکەم کاریشی کە لەوێ ئەنجامیدا، دروستکردنی مزگەوت بوو، کە بە هاوکاری موسڵمانانی کۆچکردوو و موسڵمانانی پشتیوان (کە خەڵکی مەدینەن) دروستکرا، شایانی باسیشە خودی پێغەمبەر، بەشداری کرد لە کارکردن بۆ دروست کردنی مزگەوتەوکە. زۆری نەبرد ئەو مزگەوتەی سەرەتا بە شێوەیەکی سادەو ساکار دروستکرا بوو بە مەڵبەندێکی ڕۆحی، بۆ ئەنجامدانی نوێژو هەر

پەرستنێکی تر، هەروەها بوو بە فەرمانگەیەکی ڕامیاری و سەربازی بۆ دەستنیشان کردنی پەیوەندییەکانی دەوڵەت لە ناوەوەو لە دەرەوەو گرتنی کۆڕو کۆبوونەوەی گفتوگۆو وتو وێژ سەبارەت بە بابەتە گرنگەکان.

## دووەم/ دروستکردنی برایەتی لە نێوان کۆچ کردووان و پشتیوانان:

هەنگاوی دووەمی پێغەمبەر (د.خ) لە مەدینە، چارەسەرکردنی ئەو قەیرانە دارایی و گوزەرانییە بوو کە لە ئەنجامی بەجێهێشتنی ماڵ و حاڵەوە دروستبوو بوو لای کۆچکردووانی مەککە، بە مەبەستی ڕێکخستنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و دڵنەوایی کردنی کۆچکردووان و ڕەواندنەوەی تەنهایی و بێ حاڵیان، پێغەمبەر فەرمانی دا کە هەر کۆچکردووێك و پشتیوانێك ببنە برای یەکترو لە پێناو خوا. بەمەش یەکیەتی موسڵمانان پتەوتر و ڕیزەکانیان توند و تۆڵتر دەبێت بەمەش هەر پشتیوانێك کۆچکردویەکی کردە براو هاوبەشی خۆی.

## سێیەم/ پەیڕەو دەستوور (بەڵگەنامە):

گرنگترین هەنگاوە لە مێژووی ئیسلام، لە مەدینە هەنگاوی سێیەم پێغەمبەر (د.خ) داڕشتنی بەڵگەنامەیەك بوو بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لە نێوان ئەندامانی کۆمەڵگەی موسڵمان بە کۆچکردوو پشتیوانەوە، لە لایەکی تریشەوە لە نێوان موسڵمانەکان و ئەو کۆمەڵانەی تر کە لە مەدینە نیشتەجێ بوون بەتایبەتیش جولەکەکان. ئەم بەڵگەنامەیە چەند خاڵی زۆر گرنگی تێدا بوو، کە دەتوانین بەکورتی هەندێك لە بەندەکانی بخەینە ڕوو:

١- یەکبوونی نەتەوەی موسڵمان بێ جیاوازی.

٢- پاراستنی هەر کەسێك و چینێك کە دەیەوێت بە ئاشتیانەو هاوکارانە لەگەڵ موسڵمانان بژین، و قەدەغە کردنی هەر جۆرە ستەمێك دەرحەقیان.

٣- پێویستە موسڵمان و نا موسڵمان هاوکاری یەك بن و پشتی یەك بگرن بۆ دوور خستنەوەی هەر مەترسییەك لەسەر دەوڵەت، هەروەها هەردوو لا پێویستە بەشداری خەرجی شەڕ بکەن ئەگەر روویدا.

٤- موسڵمان و نا موسڵمان، نابێت دوژمنانی دەوڵەت بپارێزن ویارمەتیان بدەن.

٥- پێویستە دەوڵەت، هەر ناموسڵمانێك سەر بخات ئەگەر دووچاری ستەم هات و دەست درێژی کرایە سەر هەر وەك چۆن موسڵمان سەر دەخات و دەیپارێزێت.

٦- هیچ کەسێك بە تاوانی کەسێکی تر لێی ناگیرێت و سزا نادرێت.

**ڕاهێنان**

هەنگاوی سەرەکی پێغەمبەر (د.خ) لە دارشتنی دەستوور بوو .. دەستوور چییە؟ (گفتوگۆ لەم بارەیەوە ساز دەدرێت)

## هەڵوێستی جوولەکەکان:

جووەکانی مەدینەو دەوروبەری، تەواو نیگەران بوون لە هاتنی پێغەمبەر بۆ شارەکەو یەکبوونی ڕیزی موسڵمانەکان و ئاشتبوونەوەی هەردوو هۆزی (ئەوس و خەزرەج) لەسەر دەستی پێغەمبەر (د.خ) کە بەر لە ئیسلام زۆر ناکۆك و دوژمن بوون، جووەکان لە سەروماڵی خۆیان نەدەترسان، دوای ئەوەی کە پەیمانیان پێدرا بە پێی بەڵگەنامەی مەدینە کە پێغەمبەر (د.خ) دەری کرد، بەڵام ترسی ئەوەیان هەبوو کە ئیسلام لەناویان بڵاو بێتەوەو پلە و پایەی ئەوان دابەزێت. لەبەر ئەوە چەند ڕێگەیان گرتە بەر بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی پێغەمبەرو پەیامەکەی، وەکو پڕو پاگەندەو بوختان هەڵبەستن و پیلان گێڕان و ئاژاوە نانەوە لە نێوان ئەوس و خەزرەج و هەوڵدان بۆ زیندو کردنەوەی دوژمنایەتی پێش ئیسلامیان.

## بەرگریکردن لە ئیسلام:

خوای گەورە ڕێگەی دا بە پێغەمبەر و موسڵمانان کە شەڕ بکەن، بە پێی ئایەتی پیرۆزی ((أذن للذين يقاتلون بأنهم ظلموا وأن الله على نصرهم لقدير* الذين أخرجوا من ديارهم بغير حق* الآ أن يقولوا ربّنا الله)) ئەم ڕێگەدانەش لەبەر ئەوە بوو، کە موسڵمانان ستەمیان لێ کراوو لەسەر وڵات و ماڵ و حاڵی خۆیان دەرکرابوون بە ناحەق، هەر لەبەر ئەوەی تەنها خوایان بە پەروەردگاری خۆیان دەزانی.

## چەند نموونەیەك لە شەڕەكانی سەردەمی پێغەمبەر (د.خ):

دوا بەدوای جێگیر بوونی پێغەمبەر (د.خ) لە مەدینەو دامەزراندنی بناغەی دەوڵەت، زنجیرەیەك لە شەڕو پێكدادان لە نێوان موسڵمانەكان لە لایەك و قورەیشی و هاوپەیمانەكانی لە هۆزە عەرەبییەكان لە لایەكی تر ڕوویدا لەوانەش:

### ١- شەڕی بەدری گەورە (٢كـ):

ئەو شەڕە بوو كە لە ڕۆژی ١٧ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی كۆچی ڕوویدا، هۆكارەكەش ئەوە بوو كە پێغەمبەر (د.خ) هانی هاوەڵەكانی دا بۆ ڕێگە گرتن لە كاروانێكی بازرگانی قورەیش لەو كاتەی لە شامەوە دەگەڕایەوە مەككە، نەك بە مەبەستی شەڕ بەڵكو لەبەر ئەوەبوو چونكە قورەیش موسڵمانەكانیان لە مەككە دەربەدەر كردبوو و دەستیان گرتبوو بەسەر هەرچی ماڵ وخانوو بەرەیە كە بەجێ یان هێشتبوو، بە ئومێدی ئەوە كە قەرەبووی بەشێكی ئەو زەرەرو زیانانەیان بكەنەوە بە دەست بەسەراگرتنی ئەو كاروانە بازرگانییەی قورەیش كە سەر بە قافڵەی ئەبو سوفیان بوو.

هەرچەندە كاروانەكە دەربازبوو، موسڵمانەكان دەستیان پێی نەگەیشت كە لە كۆچكردووەكان بوون، كەچی ئەو سوپایەی كە پێشتر ئەبو سوفیان داوای كردبوو لە مەككەوە بە هانایەوە بچن، هەر سوور بوو لەسەر درێژەدان بە بەرەو پێش چوونی و ڕوو بە ڕوو بوونەوەی سەربازە لەگەڵ موسڵمانەكان.

لە ئەنجامی ڕوو بەڕوو بوونەوە لە نێوان هەردوولا لە شوێنێك پێی دەوترێت (بەدر) ئاكامی شەڕەكە بە سەركەوتنی موسڵمانەكان كۆتایی هات. بەم سەركەوتنە گەورەیەش موسڵمانان ورەیان بەرزتر بۆوە زیاتر بڕوایان بە

خۆیان بوو هەر چەندە دەیانزانی ئەم سەرکەوتنە لە لای خواوە بوو، چونکە سەرەڕای ئەو نابەرامبەرییەی لە نێوان هەردوو هێزدا هەبوو، کەچی سەرکەوتن چونکە بیرو باوەڕێکی پتەویان هەبوو دەیان زانی لەسەر حەق دەجەنگن و بەرگری لە خۆیان دەکەن و خودای گەورەش پشت و پەنایان بوو.

## ٢- شەڕی ئوحود (٣ک):

ئەم شەڕە لە ڕۆژی شەممەی ١٥ی مانگی شەوال لە سالی سێیەمی کۆچی ڕوویدا، هۆیەکەش ئەوە بوو کە قورەیشییەکان ویستیان تۆڵەی شکستەکەی بەدر بکەنەوە، چونکە هەر یەکسەر دوای بەدر، بەخۆ کەوتن بۆ خۆ ئامادەکردن و هێزو کەرەستە کۆ کردنەوە، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی پێغەمبەر (د.خ) و هاوەڵانی. ئەوەبوو هێزێکی (٣٠٠٠) سێ هەزار کەسی بە پاڵپشتی ژمارەیەك لە هاوپەیمانانیان بەڕێ کەوتن، کە حەو سەدیان زرێ پۆش و دوو سەدیان ئەسپ سوار بوون، و حەڤدە ئافرەتیان لەگەڵدا بوو کە یەکێکیان هیندی کچی عوتبەی هاوسەری ئەبو سوفیان بوو کە باوکی لە شەڕی بەدردا کوژرا بوو بۆ تۆڵە سەندنەوە هاتبوو. هەرچی موسڵمانەکان بوون، ئەوا ژمارەیان هەزار کەس بوو، بەلام لە ڕێگە٣٠٠ کەسیان پاشگەز بوونەوە کە لە دوو ڕووەکان (المنافقین) بوون بە ڕابەرایەتی (عەبدولای کوڕی ئەبی سەلول) بەمەش ٧٠٠ کەس مانەوە.

هێزی موسڵمانەکان بەرەو گۆڕەپانی ئوحود بەڕێ کەوتن، پشتیان لە کێوی ئوحود بوو ڕووشیان لە دووژمن.

شەڕ دەستی پێ کردو موسڵمانانیش سەرکەوتن، بتپەرستەکانیش ژمارەیەکیان لێ کوژراو ئەوانی تریش پاشەکشەیان کرد. کاتێك کە کەتیبە

تیرهاوێژەکەی موسڵمانان کە لەلای کێوی ئوحود سەنگەریان گرتبوو، ئەم دیمەنەیان بینی، وایانزانی ئیتر شەڕ کۆتایی هاتووەو پێویست ناکات لە پێگەکانی خۆیان بمێننەوە، بۆیە زۆربەیان دابەزین بۆ گۆڕەپانی شەڕەکە، بۆ کۆکردنەوەی ئەو کەلوپەل و تفاقەی دوژمن دوای خۆی بەجێی هێشتبوو. کاتێك کە هێزێکی بتپەرستان تێبینیان کرد کە هێزی موسڵمانان لای کێوی ئوحودیان جێ هێشتووە، لە دواوە بۆیان سووڕانەوەو هێرشێکی لە ناکاویان کردنە سەرو توانیان بە کتوپڕی ئەنجامی شەڕەکە لە بەرژەوەندی خۆیان یەك لا بکەنەوە، حەفتا کەس لە موسڵمانان شەهید بکەن کە لە نێوانیان دا حەمزەی کوڕی عەبدولموتەڵیبی مامی پێغەمبەر بوو.

کەواتە هۆکاری سەرەکی ئەم شکستەی موسڵمانان لە شەڕی ئوحود، دەگەڕێتەوە بۆ پابەند نەبوونیان بە فەرمان و ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر (د.خ) حەز کردن لە ماڵ و دەستکەوتی شەڕ (الغنائم).



## ڕێککەوتنی حودەیبییە ( ٦ك ):

لە ساڵی شەشەمی کۆچی پێغەمبەر (د.خ)، ویستی سەردانی مەککە بکات بۆ بەجێهێنانی (عەمرە) {واتە: سەردانی کەعبەی پیرۆز سووڕانەوە بە دەوریدا کە وەختی حەج نەبێ}، ئەوەبوو بە یاوەری (١٤٠٠) کەس لە هاوەڵانی، لە مانگی (ذي القعدة) کە یەکێکە لەو مانگانەی شەڕکردن تیایدا قەدەغەیەو پیرۆزی خۆی هەیە، بەرێ کەوتن، بۆ ئەوەی کە خەڵکی مەککە تێبگەن کە ئەوان بۆ شەڕ نەهاتوون. بەڵام قورەیشییەکان ئامادە نەبوون کە ڕێگەیان پێ بدەن کە (عەمرە)ی خۆیان بکەن، و لە دوای وتو وێژ لە نێوان شاندی قورەیش بە نوێنەرایەتی (سوهەیلی کوڕی عەمر) و پێغەمبەر (د.خ) گەیشتنە ڕێکەوتنامەیەك کە بە (ڕێکەوتنامەی حودەیبییە ناسراوە) کە شوێنێکە سێ میل بەلای باکوورەوە لە مەککە دوورە.

ڕێکەوتنەکە ئەم خاڵانە بوو:-

١- وەستانی شەڕ لە نێوان هەردوو لا بۆ ماوەی دە ساڵ.

٢- دەبێت محەمەد هەر کەسێك بگێڕێتەوە لە قورەیشییەکان کە بەبێ ئاگاداری سەر پەرشتکارەکەی موسڵمان بووبێت.

٣- هەر موسڵمانێك ئەگەر ڕیزی ئیسلامەتی بەجێ بهێڵێت، قورەیش پابەند نییە بە گێڕانەوەی بۆ لای محەمەد.

٤- هەر کەس و لایەنێك سەرپشکە کە ببێتە هاوپەیمانی قورەیش یاخود ببێتە هاوپەیمانی محەمەد.

٥- محەمەد و هاوڕێیانی دەبێ ئەم ساڵ بگەڕێنەوەو (عەمرە) نەکەن بەڵکو لە ساڵی داهاتوو دا بۆیان هەیە کە بێنە ناو مەککەو ماوەی سێ ڕۆژ تیایدا بمێننەوە، و جگە لە شمشێری ناو کالان هیچی تریان پێ نەبێت.

## پەیوەندی کردنی پێغەمبەر (د.خ) بە پادشاو دەسەڵاتدارانی سەردەمی خۆی:

لەبەر ئەوەی ئایینی ئیسلام پەیامێکە، تایبەت نییە بە عەرەب، بەڵکو بەپێی چەندەها ئایەتی قورئانی پیرۆز، بۆ هەموو خەڵکانە بێ جیاوازی ڕەنگ و ڕەگەزو زوبان: ((وما أرسلناك الآ كافّة للناس بشيراً ونذيراً)) ((قل يا أيّها النّاس اني رسول الله اليكم جميعاً)).

لەم ڕوانگەیەوە، پێغەمبەر چەندەها نامەی بە دەستنووسی نووسەرەکانی نارد بۆ پاشاو میرو دەسەڵاتدارانی هاوسەردەمی وەکو (هەرقەل) قەیسەری ڕۆم و (پەروێز) کیسرای فارس و (نەجاشی) پاشای حەبەشەو (مقەوقەس) گەورەی قبتییە (مەسیحییەکان)ی میسرو میری بەحرەین و میرەکانی عوممان و پاشای یەمەن. کە ناوەڕۆکی تێکڕای ئەو نامانە داواکردن بوو لەو دەسەڵاتدارانە بڕوابێنن و بێنە ناو ئایینی ئیسلام.

## فەتحی مەککە (٨ك):

هەروەك پێشتر باسکرا، ڕێککەوتنی حودەیبییە بواری دا بە هەردوولا: قوڕەیشی و محەمەد، لە دروست کردنی هەر هاوپەیمانیەتیەك لەگەڵ هەر هۆزێکی عەرەب. ئەوەبوو (بەنو بەکر) بوونە هاوپەیمانی قوڕەیش و (خوزاعە)ش بووە هاوپەیمانی پێغەمبەر. لەم ساڵەدا (٨ك)، هۆزی بەکر دەست درێژییان کردە سەر خوزاعەو نزیکەی بیست کەسیان لێکوشتن، قوڕەیش یارمەتی چەك و دارایی دا بە بەکر. و کاتێك کە ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر گەیشت زۆر تووڕە بوو و خۆی سازو ئامادەکرد بۆ شەڕکردن لەگەڵ

قورەیش، بەڵام ئەم کارەی بە نهێنی بوو نەبادا قورەیش خۆیان ئامادە بکەن و خوێن برژێ و کوشتار ڕووبدات لە شاری مەککەی پیرۆز.

پێغەمبەر بە یاوەری دە هەزار کەس لە مەدینە دەرچوون بەرەو مەککە، لە ڕێگەشدا ژمارەیەك لە هۆزە عەرەبییەکانیان ڕەگەڵ کەوت، کاتێك کە نزیك بوونەوە لە شاری مەککە، قورەیشییەکان زۆر ترسان لە تۆڵە سەندنەوە بەڵام پێغەمبەر دانیشتوانی شارەکەی دڵنیا کردەوە کە ئەوان ئازادن و لێیان دەبووڕێت، سەرەڕای ئەو هەموو تاوانەی کە دەرهەق پێغەمبەرو موسڵمانان ئەنجامیان دابوو، هەر لە ئازاردان و بەندکردن و دەربەدەر کردن و پەیوەندی لەگەڵ پچڕاندن.

## حەجی ماڵئاوایی (١٠ك):

حەجی ماڵئاوایی تاکە حەج بوو کە پێغەمبەر لە ژیانی پێغەمیەرایەتی بە ئەنجامی گەیاندووە، ئەوەش لە ساڵی دەیەمی کۆچی بوو.

کاتێك موسڵمانان بیستیان کە پێغەمبەر بە نیازە لەو ساڵە حەج بکات، لە هەموو لایەکی دوورگەی عەرەب ڕوویان لە مەککە کرد، بۆ ئەوەی بەشداری لەگەڵ بکەن، کە ژمارەیان لە سەد هەزار زیاتر بوو. ئەوەی کە گرنگە لێرەدا ئەو وتارە بوو کە پێغەمبەر بۆ ئامادەبووانی دا، کە دوا وەسیەت و ڕاسپاردەی بوو چونکە ساڵ نەسووڕایەوە کۆچی دوایی کرد.

ئەوەی کە زۆر جەختی لەسەر کردەوە بریتی بوو لە هاندانی موسڵمانان لەسەر پابەندبوون بە فەرمان و فێرکاریەکانی ئیسلام و نەگەڕانەوە بۆ سەردەمی نەفامی و خوێنی یەکتر حەڵاڵ نەکردن و نەخواردنی ماڵی یەکتر بەهیچ شێوەیەك، هەروەها داوای لێکردن کە مافی ئافرەتان بپارێزن و بە باشترین شێوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن. و بەبیر موسڵمانانی هێنایەوە

که ئەوان هەموویان یار و یاوەری یەکترن و پێویستە دەست بگرن بە قورئانی پیرۆزو ڕەوشتی پێغەمبەر بۆ وەی سەربەرزی دنیا و قیامەت بن.

**پرسیارەکان:**

١- نیمچە دوورگەی عەرەب دەکەوێتە چ بەشێکی ئاسیاوە؟

٢- زۆر جار پێش ئیسلام کێشەو شەڕ لە نێوان هۆزە عەرەبەکان ڕوویدەدا بۆچی؟

٣- پێغەمبەر لە سەرەتای لاوێتیدا چ جۆرە کارێکی ئەنجام داوە؟

٤- بانگەوازی ئیسلام بە چەند قۆناغدا تێدەپەڕێت؟

٥- بۆچی حەبەشە هەڵبژێردرا بۆ کۆچکردنی موسڵمانەکان بەرەو ئەو وڵاتە؟

٦- گرنگترین هەنگاوەکانی پێغەمبەر (د.خ) لە مەدینەدا چی بوو؟

## بەندی دووەم

## دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدیندا

## ( ١١ك – ٤١ك / ٦٣٢ – ٦٦١ز )

پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) (١١ك / ٦٣٢ز)، سیستەمێکی فەرمانڕەوایی تازە لە دەوڵەتی ئیسلامی سەری هەڵدا، ئەویش سیستەمی خەلافەت بوو بۆ فەرمانڕەوایی، بەهۆی هاتنی یەك لەدوای یەکی چوار خەلیفە، لە دەوڵەتی ئیسلامی دا لەسەر ڕێ و شوێنی پێغەمبەر (د.خ) کە فەرمانڕەواییان کرد، وەك (ئەبو بەکری سەدیق) و (عومەری کوڕی خەتاب) و (عوسمانی کوڕی عەففان) و (عەلی کوڕی ئەبی طالب) خودا لێیان ڕازی بێت، بە هەوڵ و کۆششی ئەو خەلیفانە سنووری دەوڵەتی ئیسلامی فراوانی بەخۆیەوە دیت و پەیامی پیرۆزی ئیسلامیان لە دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەب بڵاوکردەوە لەبەرپابەندیان بە ڕێبازی پێغەمبەر (د.خ) پێیان دەڵێن خەلیفەکانی ڕاشدی.

### ئەبو بەکری سەدیق ( خودا لێی ڕازی بێت )

(ئەبو بەکر عەبدوڵلا کوڕی ئەبی قوحافە عوسمان کوڕی عامر تمیمی) بە دوو ساڵ پاش (ساڵی فیل) لە مەککە لەدایك بووە.

ئەبو بەکری سەدیق دۆستایەتی لەگەڵ پێغەمبەر (د.خ) هەبووە، بەر لەوەی کە سروشی لە لایەن خواوە پێ بگات، و لەو کاتەی کە پەیامە پیرۆزەکەی ئیسلام بە پێغەمبەر (د.خ) گەیشتووە، یەکەم کەس لە پیاوان ئەبو بەکر بووە کە باوەڕی پێ هێناوەو موسڵمان بووە.

ئەبو بەکر پێش موسڵمان بوونی بە پیشەی بازرگانییەوە خەریك بووە.

## بوونی بە خەلیفە

کە پێغەمبەر لە ساڵی (١١ك / ٦٣٢ز) کۆچی دوایی کرد، دەوڵەتی ئیسلامی وای دەخواست کە یەکێك ببێت بە جێنشینی و کاروباری دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر ڕێ و شوێنی ئەودا بەڕێوەببات و ئەو پەیامە پیرۆزە بگەیەنێت بە نەوەکان، ئەوەبوو کە موسڵمانەکان لە مەدینە بە پشتیوانەکان و کۆچکردووەکانەوە گفتیان داو ئەبو بەکری سەدیق یان دیاریکرد بۆ جێنشینی (الخلیفة) پێغەمبەر (د.خ)، بەو گفتەش دەگوترێ گفتی تایبەت، چونکە تایبەت بوو بە چەند هاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ)، لە (سەقیفەی بەنی ساعدە) و دەستنیشانکردنی ئەبو بەکر بۆ خەلافەت لە هەمان کاتدا بوو کە پێغەمبەر (د.خ) تێیدا کۆچی دوایی کردبوو.

## وتاری ئەبو بەکری سەدیق
## ( خودا لێی ڕازی بێت )

دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان ئەبو بەکریان بە خەلیفەی پێغەمبەر (د.خ) دانا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی ئیسلامی، ئەبو بەکریش وتارێکی گرنگی بۆ دان (خەڵکینە، من بە فەرماندەتان دانرام، لە هەمووتان باشتر نیم، ئەگەر باش بووم هاریکاریم لەگەڵدا بکەن و ئەگەر خراپ بووم ڕاستم بکەنەوە، ڕاست گۆیی پاکییەو درۆش ناپاکییە، بێ هێزتان لای من بەهێزە تا ئەو مافەی لێ زەوت کراوە بۆی دەگێڕمەوە خودا بیکات، بەهێزیشتان لای من بێ هێزە تا ئەو مافەی لێ وەردەگرمەوە خودا بیکات، هەر نەتەوەیەك واز لە شەڕ لە ڕێی خودا (الجهاد) بهێنێت خودا سەر شۆڕی دەکات، گوێ ڕایەڵم بن تامن گوێ ڕایەڵی خوداو پێغەمبەر بم، ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرم کرد لەسەرتانە سەرپێچی فەرمانەکانم بکەن).

## دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفە
## ئەبو بەکری سەدیق ( خودا لێی ڕازی بێت )

پێغەمبەر (د.خ) لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، هەوڵی دەدا کە ڕەگەزپەرستی و تیرەگەری لە نێوان موسڵمانان نەهێڵێت، زۆرجاران قورئان خوێنی بۆ ئەو تیرەو هۆزانە دەنارد کە باوەڕیان پێ هێنابوو، بەلام بنەمای ئاینی ئیسلام تێ نەگەیشتبوون، و پیاوانی خۆی دەنارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات بەپێی بنەماکانی ئاینی ئیسلام، پەیوەندی نێوان پێغەمبەر (د.خ) هەندێك لەو تیرەو هۆزانە پەیوەندییەك بوو کە لەسەر ئاستی کەسیەتی بووە نەك لەسەر ئاستی ئاینی، لەو کاتەی کە پێغەمبەر (د.خ) ماڵئاوایی کرد، ئەو تیرەو هۆزانە وایان دەیانزانی کە ئاین کۆتایی هات، بۆیە بەشێکی زۆری ئەو تیرەو هۆزانەی نیمچەدوورگەی عەرەب لە ئاینی ئیسلام هەلگەڕانەوە، لە مێژووی ئیسلامدا ناویان بە بزوتنەوەی هەلگەڕاوەکان هاتووە.

هەندێك کەس لە پیاوان و ئافرەتان دەرکەوتن کە بانگەوازی پێغەمبەرایەتیان بۆ خۆیان دەکرد، و هانی ئەو هەلگەڕاوانەیان دەدا بۆ دژایەتی کردنی ئاینی ئیسلام، لەوانەش (موسەیلەمەی کەذاب و ئەسوەد عەنسی و عەلقەمەی کوڕی سلاقە و طليحة بنت خويلد الأسدي ........ زۆرانی تر).

خەلیفە ئەبو بەکریسەدیق (خودا لێی ڕازی بێت) پاش ڕاوێژکردن لەگەڵ موسڵمانان و فەرماندە سەربازییەکان، بڕیاریدا کە بە توندی بەرپەرچیان بداتەوە، فەرماندەی لەشکری بە خالد کوڕی وەلید سپارد، و توانی بە سەریاندا زاڵ بێت و دەوڵەتی ئیسلامی لە مەترسیان بپارێزێت.

## هۆیەکانی بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکان

بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان لە سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکری سەدیق (خودا لێی ڕازی بێت) سەری هەڵدا بەڵام ئەو ڕووداوە کت و پڕ نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی کۆمەڵێك هۆکار هاتە کایەوە وەك:

١/ عەرەبەکانی نیمچەدوورگە شانازیان بە تیرەگەری دەکرد، کە ئایینی ئیسلام بڵاو بووەوە، ناکۆکی و دەمارگیری نەهێشت، کە پێغەمبەر (د.خ) ماڵئاوایی یەك جارەکی کرد، ئەو عەرەبانە هەڵگەڕانەوە بۆ پیادەکردنی داب و نەریتە کۆنەکانیان وایانزانی کە ئایینی ئیسلام کۆتایی پێهات.

٢/ هەندێك تیرەو هۆز هەبوون لایەنگیری پێغەمبەر (د.خ) بوون لەسەر ئاستی پەیوەندی کەسێتی و سیاسی، بەڵام کە پێغەمبەر (د.خ) کۆچی دوایی کرد، ئەو پەیوەندی و لایەنگیرییەیان بۆ ئیسلام نەما.

٣/ زەکات دان هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ هەڵگەڕانەوە بە تایبەتی لە هۆزەکانی یەمەن و یەمامە کە ئامادەنەبوون زەکات بدەن. هۆزی (بني تميم) ئامادەیی خۆی ڕاگەیاند کە لە ژێر ئایینی ئیسلام دەمێنێتەوە بەمەرجی نەدانی زەکات.

## سەرکوتکردنەوەی بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان

خەلیفە ئەبو بەکری سەدیق (خودا لێی ڕازی بێت) لە سەرەتای سەرهەڵدانی بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکان هەستی کرد، کە مەترسیان بۆ سەر دەوڵەتی ئیسلامی هەیە، بۆیە بەدوو ڕێگە هەوڵی سەرکوتکردنەوەی بزووتنەوەی هەڵگەڕاوەکانی دا.

١/ سەرەتا بەکاری دبلۆماسی دەستی پێکرد، وەك ناردنی هەندێك نێردراوی خۆی بۆ ناوچە جیاجیاکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی، و داوای لە هەڵگەڕاوەکان کرد کە بگەڕێنەوە بۆ ناو کۆمەڵگای ئیسلام و ژێر ئاڵای ئیسلام.

٢/ ڕێگای دووەم بریتی بوو لە ئامادەکردنی لەشکرو دیارکردنی فەرماندەکانی، هێزەکە لە (١١) لەشکر پێکهاتبوو، هەر سەرلەشکرێك ناوچەیەکی لە نیمچە دوورگەی عەرەبی پێ سپێردرابوو بۆ گێڕانەوەی بۆ ژێر ئاڵای ئیسلام.

پاش زنجیرە شەڕێك خەلیفەی ئیسلام سەرکەوتنی بە دەست هێنا، زۆربەی ئەم ناوچانەی کە لە کاتی شەڕی هەڵگەڕاوەکان یاخی بوون کەوتنە ژێر ڕکێفی ئیسلامەوە. ئەبو بەکر لە ساڵی ١٣ی ك کۆچی دوایی کرد ماوەی خەلیفەتیەکەی دوو ساڵ و سێ مانگ بوو.

## عومەر کوڕی خەتاب ( خودا لێی ڕازی بێت )
## ( ١٣ك – ٢٣ك / ٦٣٤ز – ٦٤٤ز )

ناوی عومەری کوڕی خەتاب کوڕی نوفیلە بە عودەی کوڕی کەعب دەگاتەوە پێغەمبەر (د.خ)، بنەماڵەی عودەی تیرەیەك بوون لە قورەیش، و باوکی عومەر کەسایەتیەکی دیارو پلەو پایەیەکی هەبوو لەناو قورەیشیەکان، عومەری کوڕی خەتاب پێش ئیسلام بوونی خوێندنەوەو نووسینی بە دروستی دەزانی، سەردەمی لاوێتی بە شوانی لای باوکی بردۆتە سەر، لە تەمەنی ٢٦ بیست و شەش ساڵیدا موسڵمان بووە، پێغەمبەر (د.خ) نازناوی (الفاروق)ی لێناوە، جگە لە کونیەی (أبو حەفس).

لەماوەی خەلافەتی عومەری کوڕە خەتاب (خودا لێی ڕازی بێت) فتوحاتی ئیسلام دەستی پێکردووە، زۆربەی شوێنەکانی حیجاز و عێراق و شام ڕزگار کراون و سنوری دەوڵەتی ئیسلامی فراوانیی بەخۆیەوە دیت، کە لەسەر حسابی دەوڵەتی بێزنتینی و ساسانی بوو.

## کارە گرنگەکانی سەردەمی خەلیفە عومەر کوڕی خەتتاب

هەرچەندە هەوڵی فراوانخوازی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفەی یەکەم ئەبو بەکر دەستی پێ کرد، بەڵام لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابداگەیشتە لووتکەی فەتحی دەوڵەتی ئیسلامی شام و عێراق و کوردستان و ئێران و میسریشی گرتەوە، بۆیە فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی وای دەخواست کە سیستەمێك هەبێت بۆ ڕێکخستن و گەشە پێدانی دام و دەزگاکانی دەوڵەت، بە هۆی تێکەڵ بوونی شارستانی ئیسلامی بە شارستانی نەتەوەکانی تر لە ڕێگای ئەو سیاسەتەوە، کە وای کرد موسڵمانەکان لە خاکی نەتەوەکانی تر نیشتەجێ ببن و ئەوانیش تێکەڵ بە

شارستانی ئیسلامی بن، چ بەهۆی موسڵمان بوونەوە، یان بەهۆی بەرژەوەندیەکانی سیاسی و پەیوەندیەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

### ١/ ڕێکخستنی باری گوزەرانی سەربازەکان و شوێنە ڕزگارکراوەکان:

لەبەرئەوەی کە سەربازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی لە پێناو بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام و بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام تێدەکۆشان، لەسەر دەوڵەت بوو، کەباری گوزەرانیان ڕێکبخات و پێویستییەکانیان دابین بکات.

### ٢/ ڕێخکستنی دیوانەکان و مووچەی سەربازان:

لەگەڵ فراوان بوونی سنووری دەوڵەتی ئیسلامی، بەهۆی سیاسەتی فراوانخوازییەوە، سەروەت و سامانێکی زۆر لە دەوڵەتی ئیسلامی کەڵەکە بوو، بە تایبەتیش لە عێراق، کە گەنجینەی ساسانیەکان کەوتە دەست موسڵمانەکان، لە زێڕو زیوو خشڵی گرانبەهای ئافرەتان و قوماش و جل و بەرگی نایاب و ئەو سەروەت و سامانانە پێویستی بەوە هەبوو ڕێکبخرێت، بە سیستەمێکی دادپەروەرانە بەسەر سەربازەکان دابەش بکرێت، چونکە سەربازەکان پیشەیەکی تریان نەبوو، بۆ دابینکردنی بژێویان بۆیە بەڕێوە و دیوانی سەربازی دانرا، خەلیفە عومەر یەکەم کەس بووە، کە ناوی سەربازانی لە دیوانی سەربازی تۆمار کردووە و مووچەو یارمەتی بۆ بڕیونەتەوە.

### ٣/ سیستەمی دارایی:

ئەو سیستەمە خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) دای مەزراند، سیستەمێکی دادپەروەرانەو دروست و گونجاو بوو، بە پێی پێویستی نەتەوەکان کە تیایدا دەژیا، سەرچاوەی دادپەروەرییەکەی هەڵقوڵاوی قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بووە.

لەگەڵ کەڵەکەبوونی سەروەت و سامان لە دەوڵەتی ئیسلامی، ئەو بارودۆخە وای دەخواست سیستەمێك دابمەزرێت بۆ ڕێکخستنی داهات و خەرجییەکان، خەلیفە عومەر سیستەمێکی هێنایە کایەوە بەناوی (بیت المال) بۆ پاراستنی ماڵ و موڵك و ڕێکخستنی داهات و خەرجییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی کە وەك وەزارەتی دارایی سەردەمی ئێستا بوو.

**ڕاهێنان**

(بیت المال) ماڵ و موڵکی دەوڵەتی ئیسلامی تێدا دەپارێزرا ..

لەم سەردەمەی ئێستا چ دەزگایەك جێگەی (بیت المال) دەگرێتەوە؟

گرنگترین داهاتەکانی (بیت المال) بریتی بوون لە:

(الخراج، الجزية، الزکاة) (جزیە (سەرانە)، خەراج (زەویانە) یان موڵکانە.

### ٤/ ڕێکخستنی کارگێڕی:

لەپاش فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی، بە تایبەتیش لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت)، دەوڵەتی ئیسلامی دابەش ببوو، بۆ چەند یەکەیەکی بەڕێوەبردن، ئەویش بۆ ئاسانکردنی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بووە وەك چاودێری کردنە سەر داهات و یەك لا کردنەوەی کێشەکانی کۆمەڵگا.

خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب لەسەر هەر ولایەتێك فەرمانبەرێکی دانا، بۆ هەڵسوڕانی کاروباری وولایەتەکە، کە دەسەڵاتی خەلیفەی وەرگرتبوو، پێی دەوترا سەردار (والي)، هەرسێ دەسەڵاتی یاسایی و ڕاپەڕاندن و قەزایی لە دەست دابوو، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی پشتی بە ڕاوێژکارەکان دەبەست.




### ٥/ ساڵنامەی کۆچی:

بەر لە دەرکەوتنی ساڵنامەی کۆچی، دانیشتوانی نیمچە دوورگەی عەرەب ڕووداوو کارەساتەکانیان بۆ دیارکردنی مێژوو بەکاردەهێن، نموونە ساڵی فیل و شەڕی فجار دوو ڕووداوی مێژوویی گرنگ بوون لە نیمچە دوورگەی عەرەبی، بەڵام کە خەلیفە عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) بوو بە خەلیفە پێغەمبەر (د.خ) بیری کردەوە کە دەبێت ساڵنامەیەکی تایبەت بە موسڵمانان هەبێت، بۆ ئەو مەبەستەش یەکەم ڕۆژی کۆچکردنی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ هاوەڵەکانی لە مەککەوە بۆ مەدینە بە ساڵی یەکەمی کۆچی دانا ( ١ك / ٦٢٢ز ) و مانگی محرم بە یەکەم مانگی ساڵی کۆچی دانرا، و لەبەر ئەوەش ئەو کۆچە بە ساڵی یەکەم دانرا، چونکە ساڵێکی گرنگ بوو لە مێژووی ئیسلامی، و لەگەڵ ئەو کۆچکردنەش دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە دامەزرا.

### ٦/ دادوەری:

لەسەردەمی خەلیفە ئەبو ئەبو بەکری سەدیق (١١ك / ١٣ك)، عومەری کوڕی خەتتاب بە قازی ناسرابوو ئەمیش بەهۆی کەسایەتی هەق خوازو دادپەروەری و چاونەترسیەکەی بوو. کە کێشەکانی یەکلا دەکردەوەو، کاتێك کە عومەری کوڕی خەتتاب بە خەلیفە هەڵبژێردراو بەهۆی شەڕەکانی فراوانخوازییەوە دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو، موسڵمانەکان بە نەتەوەکان گەیشتن، زۆرجاران کێشە لە نێوان موسڵمانەکان و نەتەوەکانی تر سەری هەڵدەدا، بۆیە پێویست بوو ئەو کێشانە بە دادپەروەرانە چارەسەر بکرێن.

بۆیە لەهەر ناوچەیەك قازی دانرا کە بەپێی شەریعەتی ئیسلامی کێشەکانی یەکلادەکردەوە.

**چالاکی/**

((دادوەر نوێنەری یاسایە))

گرنگترین سیفەتەکانی دادوەر (قازی) چین ...؟

## عوسمانی کوڕی عەففان ( خوا لێی ڕازی بێت )
## ( ٢٣ – ٣٥ك / ٦٤٤ – ٦٥٦ز )

عوسمانی کوڕی عەففان کوڕی ئەبیلعاص، لە مەککە، بە پێنج ساڵ دوای ساڵی (فیل) لەدایك بووە، لە موسڵمانەکانی بەرایی بووە، ناوبانگی بە زانیاری ئایینی و بەشەرم و دڵ پاکی و خێرخوازی دەرکردووە. و یەکێکیش بووە لەو (١٠) دە کەسەی کە مژدەی بەهەشتیان پێدراوە. پێغەمبەر (د.خ) ڕوقیەی کچی خۆی لێ مارە کرد، کاتێکیش ڕوقیە وەفاتی کرد، پێغەمبەر (د.خ) ئوم کەلسومی کچی لێ مارە کرد بۆیە نازناوی (ذو النورین) ی لێ نراوە.

### ڕوداوە گرنگەکانی سەردەمی خەلیفە عوسمان کوڕی عەففان اخوا لێی ڕازی بێتا

لە سەردەمی خەلیفە عوسمان کوڕی عەففان، سێ دیاردەی گرنگ دەرکەتن، یەکەمیان جەنگەکانی ڕزگارکردن بوون، دووەمیان کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆز بوو، وە سێیەمیشیان شەهیدکردنی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفان و سەرهەڵدانی ناکۆکی لە نێوان کۆمەڵگای موسڵماناندا بوو.

### ١/ فتوحاتی ئیسلامی :

لە ساڵی (٢٥ك / ٦٤٥ن) لەشکرێکی لە سەربازەکانی شام و عێراق ئامادەکرد بە فەرماندەی (حبيب بن مسلمة الفهري) بۆ دژایەتی ڕۆمە بیزەنتەکان لە باکوری کوردستان و ئەرمەنستان و گەیشتن بە(عمورية) ئاسیای بچووك. لە ساڵی (٢٧ك / ٦٤٧ن) خەلیفە عوسمان ڕێگای دا بە (عەبدوڵلا کوڕی ئەبی سرح) کە ئەفریقیا ڕزگار بگات، ئەویش توانی بەرەو

ولآتی مەغریب بچێت و طرابلس ڕزگار بکات تا گەیشتە سبیطلة (باکووری شاری قەیرەوان)، هەر لە سەردەمی ئەم خەلیفەیە یەکەم کەشتیگەلی ئیسلامی دروست کرا کە توانی کەشتیگەلی ڕۆمە بیزەنتییەکان لە دەریای ناوەڕاست بشکێنن و چەند دورگەیەکی وەك قوبرص و ڕۆدس ڕزگار بکەن.

### ١/ کۆکردنەوەی قورئان:

کۆکردنەوەی قورئان لە کارە گرنگەکانی سەردەمی عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت) بوو کۆکردنەوەش بە یەك جار نەکراوە، بەڵکو هەموو خەلیفەکانی ڕاشیدین بە پێی توانای خۆیان بەشداریان لە کۆکردنەوەی قورئان کردووە، لە سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکری سەدیق دەستی پێ کرا، لە دوای ماڵئاوایی خەلیفە ئەبو بەکر ئەوەندەی کرابوو بە خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب سپێردرا.

و خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) لەسەر هەمان ڕێو شوێنی ئەبو ئەبو بەکری سەدیق ڕۆیشت بۆ کۆکردنەوەی قورئان، ئەوە لە لایەك لە لایەکی دیکەش حەزی خەڵك زیادی کرد بۆ خوێندنەوەی قورئان و لەبەرکردنی و دوورکەوتنەوە لە هەڵە، بۆیە خەلیفە عومەر هەوڵی دا کە قورئان جارێکی تر کۆبکاتەوەو، لە دوای شەهیدکردنی خەلیفە عومەر، ئەو قورئانە نووسراوە لای (حەفسە)ی کچی خەلیفە عومەر پارێزرا.

قۆناغی دوایی کۆکردنەوەو نووسینەوەی قورئان لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان دەست پێدەکات، ئەویش لێژنەیەکی چوار کەسی پێکهێنا کە زمان پاراوو شارەزابوون، جگە لەوەی کە ئەوان جێی متمانەو باوەڕی خەلیفە عوسمان بوون، بۆ بە ئاکام گەیاندنی ئەو ئەرکە پیرۆزە، ئەوانیش (زید کوڕی ثابت) و (سعید کوڕی عاص) و (عەبدوڵڵا کوڕی زبیر) و

(عەبدولرەحمان كوڕی حارث) بوون، و مێژوو نووسان كۆكن لەسەر ئەو لێژنەیە كە چوار دانە قورئانیان نووسیەوە، بۆ شارە سەرەكییەكان و وڵاتەكانی دەوڵەتی ئیسلامیان نارد، وەك مەككەو دیمەشق و بەسرەو كوفە.

### ٣/ شەهید كردنی خەلیفە عوسمان كوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت):

لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی كوڕی عەفان (خوا لێی ڕازی بێت) هەندێك لە لەشكری ئیسلام لە خەلیفە هەڵگەڕانەوەو كە بوونە هۆی شەهید كردنی خەلیفە لە ساڵی ٣٥ك / ٦٥٦ز ئەوەش بە كارەساتێكی گەورە لە مێژووی ئیسلام دەژمێردرێت كە پێی دەگوترێت (الفتنة الكبرى) (فیتنەی گەورە).

## خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی طالب

## ( ٣٥ – ٤٠ك / ٦٥٦ – ٦٦٠ز )

عەلی کوڕی ئەبی طالب (خوا لێی ڕازی بێت) کوڕی عەبدولمەناف کوڕی عەبدولموتەلب، ئامۆزای پێغەمبەرە(د.خ) یەکێکیش بووە لە هاوەڵە نزیکەکانی، لە شاری مەککە لەدایك بووە، یەکەم کەس بووە لە لاوانی تازەپێگەیشتووکە موسڵمان بووە، لە سەرەتای موسڵمان بوونیەوە لە ماڵی پێغەمبەر (د.خ) گەورە بووە، بەهۆی ئەوەی کە ئەبی طلب باری ئابووری و گوزەرانی لاواز بووە.

لەو کاتەی کە پێغەمبەر (د.خ) هەستی کرد کە عەرەبە بێ باوەڕەکان هەوڵی کوشتنی دەدەن، بۆیە هەوڵی دا کە شاری مەککە بەجێ بهێڵێت ڕوو لەشاری یەثرب بکات، بۆ ئەو مەبەستەش (عەلی کوڕی ئەبی طالب) ی لە ماڵی خۆی لە ناو پێخەفی خۆی بەجێهێشت بۆ ئەوەی وا بزانن کە پێغەمبەر (د.خ) لە ماڵی خۆیەتی. لە هەموو شەڕەکانی پێغەمبەر (د.خ) بەشداری کردووە تەنها لە شەڕی تبوك نەبێ، لە زۆربەی شەڕەکانیش هەڵگری ئاڵای موسڵمانان بووە.

پێغەمبەر(د.خ) فاتیمەی کچی خۆی لە عەلی کوڕی ئەبی طالب مارە کردووە.

### ڕووداوەکانی سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی طالب ( خوا لێی ڕازی بێت ):

کە خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی طالب دەسەلاتی لە دەوڵەتی ئیسلامی وەرگرت، دەوڵەت توشی کێشەو گرفتی ناو خۆ هاتبوو بەهۆی شەهید کردنی خەلیفە عوسمان کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت) لە لایەك لە یەکی دیکە قوڕەیشیەکانیش لە ویلایەتەکان سەروەت و سامانێکی زۆریان کۆکردەوەو بەهۆی دەست گرتن بەسەر زەویە کشتوکاڵیەکان و لایەنی ئایینیان تا ڕادەیەك فەرامۆش کردبوو.

عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خوا لێی ڕازی بێت) سەرەتا دەستی کرد بە لادانی ئەو والیانەی کە لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت) دانرابوون، چونکە خەڵکی ولایەتەکان لە دەستی ئەو والیانە بەگازاندە بوون، وە هەوڵی دا هەندێك والی لایەنگری خۆی لە شوێنی ئەو والیانە دابنێت کە لەگەڵ سیاسەتی دروستی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەگونجێن، بەناوبانگترین والی کە خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالیب ویستی لای بدات معاویەی کوڕی ئەبی سفیان بوو لە شام، چونکە معاویەو تیرەی ئومەوی دەیانویست شەهیدکردنی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان (خوا لێی ڕازی بێت) بکەن بە بیانوو دروشمی سیاسەتیان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات.

**ڕاهێنان**

پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) لە سەردەمی ڕاشدییەکان چوار خەلیفە حوکمڕانیان کرد ئەمانەبوون.

| | |
|---|---|
| | عومەری کوڕی خەتاب |
| | |

قوتابی ئازیز سێ خانەی بەتاڵ بەناوی گونجاو پڕ بکەوە.

## دەرکەوتنی گروپی خەوارجەکان (الخوارج):

خەوارجەکان بریتیبوون لە کۆمەڵە سەربازێکی لەشکری خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی طالب کە لەشەڕی (سیفین)لە لەشکری عەلی جیابوونەوە، ئەو شەڕەش لە نێوان لەشکری خەلیفە عەلی و معاویە ڕوویدا، وە خەوارجەکان سەرکردەیەکیان بۆخۆیان هەڵبژارد بەناوی (عەبدوڵلا بن وهب الراسبي) و نازناوی خەلیفەیان (امیر المؤمنین) یان پێدا، خەلیفە عەلی بە

توندی دژایەتی کردن، بە جم و جۆڵی خەوارجەکان ئاسایش و جێگیری دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفە عەلیدا شێوێندرا، لە ئەنجامیشدا خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تالیب بە دەستی خەوارجەکان شەهید کرا جێگای ئاماژەیە خەواریجەکان دواتر لەسەردەمی خەلافەتی ئومەوی و عەباسی بوونە دیارترین بزوتنەوەی دژی دەسەلأت.

## (بەردەوامبوونی فتوحات)

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینەدا، ئەو پەیامە پیرۆزە لە هەموو نیمچە دوورگەی عەرەبی بلأوبووەوە، و یەکەیەکی ئایینی و رامیاری لە دەوڵەتی ئیسلامی دروست بوو، لە سەردەمی خەلیفە ئەبو بەکری سەدیق (١١ك – ١٣ك) وای دەخواست کە ڕاسپاردەکانی پێغەمبەر (د.خ) جێبەجێ بکات، ئەو ڕاسپاردەیەش بریتی بوو لە دوورخستنەوەی بێگانەکان لە دەوڵەتی ئیسلامی و بەرزکردنەوەی ئالأی ئیسلام و گەیاندنی پەیامی پیرۆزی ئیسلام بە ولأتان.

سەرەتا خەلیفە ئەبو بەکری سەدیق وای بە چاك زانی کە لەشکری ڕۆمە بیزەنتەکان لە ولأتی شام دووربخاتەوە، لەبەر چەند هۆیەك، وەك نزیکی لە دەوڵەتی ئیسلامی ئەوە لە لایەك لە لایەکی تریش ڕۆمە بێزەنتەکان دەستیان هەبوو لە هاندانی خەڵك بۆ هەڵگەڕانەوەیان لە ئیسلام و دژایەتی کردنی، وهۆیەکی تر ئەوەبوو کە ڕۆمە بێزەنتەکان دەسەلأتیان بەسەر ئەو ڕێگا بازرگانیانەدا دەڕۆیشت کە بەرەو ولأتی عیراق و میسر دەچوون.

خەلیفە ئەبو بەکری سەدیق هانی خەڵکی نیمچە دوورگەی عەرەبی دا، بۆ پشتیوانی کردنی موسڵمانان بۆ ڕزگار کردنی ولأتی شام لەدەست ڕۆمە بێزەنتەکان، بۆ ئەو مەبەستەش چوار لەشکری ئامادەکرد.

## شەڕی یەرموك (١٢ك – ٦٣٤ز)

(هەرقل)ی سەرکردەی ڕۆمەکان کە زانی موسڵمانەکان نیازی لەشکر کردنیان هەیە بۆ شام، ڕێی کۆکردنەوەی لەشکری دا لە ڕۆمەکان و عەرەبەکانی شام وەك دانیشتوانی دەوڵەتی غەساسنەو خەڵکی جەزیرەو ئەرمینیا، سەرچاوەکان ژمارەی ئەو لەشکرە بە (٢٠٠) هەزار سەرباز مەزەندە دەکەن.

لەشکری موسڵمانەکان و ڕۆمەکان لە دۆڵی یەرموك هەڵیاندا، هەردوو لا لە هەوڵی خۆ پرچەك کردن و کۆکردنەوەی لایەنگیر بوون، بۆ بەهێزکردنی لەشکریان، شەڕێکی قورس لەنێوان هەردوو لادا ڕوویدا موسڵمانەکان بە خۆڕاگری سەرکەوتن و ڕۆمەکان لەو شەڕەدا شکان.

## فەتحی قودس (١٥ك / ٦٣٦ز)

دوای دەست بەسەرداگرتنی دیمەشق لە لایەن موسڵمانەکانەوە، لەسەر داوای خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت) بڕیاریدا کە شاری (قودس)یش ڕزگار بکەن و لەدەست بێ باوەڕەکانی دەریبهێنن، سەرەتا (ئەبو عوبەیدەلجەراح) کە فەرماندەی لەشکری موسوڵمانا ن لایەنی گفوگۆی گرتەبەر، نامەی بۆ خەڵکی قودس نارد و داوای لێکردن بۆ باوەڕهێنان بە خوداو پێغەمبەر (د.خ)ی یان سەرا نەدان لە بری موسڵمان بوون یان شەڕکردن.

لەشکری موسڵمانەکان بە فەرماندەی (ئەبو عوبەیدەلجەراح) گەیشتە نزیك قودس نامەی دووەمی نارد بۆ دانیشتوانی قودس، دووپاتی هەمان داخوازییەکانی پێشووی کردەوە، بەلاّم ئەوجارەش وەلاّم نەبوو، بۆیە گەمارۆی ئەو شارەیان دا، تا دانیشتوانی قودس ناچاربوون پەیوەندی بە

فەرماندەی موسڵمانەکان بکەن، داوای ڕێکەوتنێکی لەو جۆرەیان کرد کە لەگەڵ دانیشتوانی دیمەشق کرابوو، بە مەرجێك ئەو ڕێکەوتنە لەسەر دەستی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب بێت، لەبەر ئەوەی ئاگادری دادپەروەری و پەیمانەکانی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب بوون.

**ڕاهێنان**

**قوتابی ئازیز:** ئێستا قودس لەبن دەستی کێیە؟

(سەلاح الدین ئەیوبی) سەرکردەی بەناوبانگی بەرەگەز کورد لەپاش شەڕی .... قودسی لەبن دەستی خاچدروشمان ڕزگار کرد

بۆشایی سەرەوە بە وشەی گونجاو پڕ بکەوە.

## هاتنی لەشکری موسڵمانان بۆ عێراق

دوای ئەوەی کە موسڵمانەکان چەندان شوێنیان و لە دەست ڕۆمە بیزەنتەکان ڕزگارکرد، بیریان لە عێراق کردەوە، بۆ ئەوەی لەدەست ساسانییەکان دەری بهێنن، چونکە عێراق هاوسنووربوو لەگەڵ وڵاتی شام و مەترسی هەبوو بۆ دەوڵەتی ئیسلامی.

خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) فەرماندە (ئەبو عوبەیدە کوڕی مەسعود الثقفي) دیار کردو بە لەشکرەوە بۆ دەست بەسەردا گرتنی عێراق و دەرهێنان لەژێر دەسەڵاتی ساسانییەکان، و لە ڕێگادا فەرماندە (موثەننا کوڕی حارثة الشیباني) بە لەشکرەوە ناردی پەیوەندی بەو سوپایەوە کرد، سوپای موسولمانان لە ڕووباری فورات پەڕینەوە بە لەشکری ساسانیەکان گەیشتن لە ئەنجام دا فەرماندەی موسڵمانەکان (ابو عبيدة کوڕی الثقفي) شەهید کرا.

فەرماندە (مثنی کوڕی حارثـة) بـوو بەسـەر لەشـکرو پلانێکـی تـازەی دانـا ئەویش ئـەوەبو لـە لایـەك داوای لەشـکری زیـاتری لـە مەدینـە کردبـوو، و لـە لایەکی تر ساسانییەکانی بە فڕوفێڵ ڕاگرت کاتێك لەشـکری زیـاتری بـۆ هـات توانیان لەشکری ساسانیەکان بشکێنن لە شوێنێك پێی دەوترێـت (البویـب) و سـەرکردەکەیان بـە نـاوی (مهـران) لەناوچـوو، و لەشـکری ساسـانییەکان گەڕایەوە شاری مەدائین.

## شەڕی قادسیە (١٤ك / ٦٣٦ز)

فەرماندە (سەعد کـوڕی ئـەبی وەقـاس) بـە چـوار هـەزار سـەربازەوە بـەرەو عێـراق کەوتـە ڕێ، لەشـکری موثـەننا کـوڕی حارثـة کـە لـە عێـراق بـوو پەیوەندیان پێکرد، پێش شەڕ دەست پێکردن گفتوگۆ لە نێوان هـەردوو لادا دەستی پێکرد، وە داوایان لـە ساسـانییەکان کـرد کـە ئـازادن لـە دیـارکردنی چارەنووسیان بـۆ موسـڵمان بـوون، یـان سـەرانەدان. بـەڵام فارسـەکان ڕازی نەبوون، لە ئاکـامی شـەڕێکی قورسـدا کـە سـێ ڕۆژی خایانـد، موسـڵمانەکان سەرکەوتن بە سەرکردایەتی (سعد) و پاشان دەستیان گـرت بەسـەر مـەدائین (پایتەختی دەوڵەتی ساسانی کە دەکەوتە خوار بەغدای ئەمڕۆ).

## کوردستان لەبەردەم سیاسەتی فە تحی ئیسلامی

لە سەرەتای دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام کورد پەیوەندی بە ئیسلام کردووە و ئەو ئایینەی بە ڕاست زانیوەو وەك پەیامێکی پیرۆز وەریگرتووە، و لەگەڵ ئەوەشدا کوردەکانی جەزیرە لەڕێگای پرۆسەی فتوحاتەوە وەك نەتەوەکانی تر بە موسڵمانەکان گەیشتوون. ئەویش لە ڕێگای سیاسەتی فراوانخوازی ئیسلامی بۆ ناوچەی جەزیرە لەسەر دەستی فەرماندەی موسڵمانەکان (عیاض کوڕی غنم) لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت)، کە هەندێك سەرچاوە دەست بەسەرداگرتنی شارەکانی جەزیرە بۆ ساڵی (١٦ – ١٨ك) دەگێڕنەوە. ئەوەی گرنگە کە لێرەدا باسی لێبکەین ئەوەیە کە موسڵمانەکان هاتن بۆ کوردستان و کوردەکان و موسڵمان بوون، هەندێك موسڵمانی عەرەب لە شارە کوردییەکان نیشتەجێ کران.

لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتابیش (خوا لێی ڕازی بێت) هەموو شارە کورد نشینەکانی جەزیرە دەستیان بەسەردا گیرا، وەك شاری رأس العین و نەسیبین و میافارقین و ئامەد و ڕوها و ماردین و داراو جەزیرەی أكراد (جەزیرە ئیبن عومەر) بازبدی و زۆزان و ئەرزەن، هەموو ئەو شارانەش لەسەر دەستی فەرماندەی موسڵمانان (عیاض کوڕی غنم) دەستی بەسەردا گیراو لەدەست ڕۆمەکان دەرهێنرا و بەو شێوەیە ئایینی ئیسلام لە شارەکانی هەرێمی جەزیرە بڵاو بووەوە.

بەیەك گەیشتنی کوردەکانی شارەزوور و شارە کورد نشینەکانی تر بۆ ساڵی (١٦ك / ٦٣٧ز) دەگەڕێتەوە، ئەویش بەهۆی ئەو لەشکرەی هاشمی کوڕی عەتەبە کوڕی ئەبی وەقاس کە بەرەو جەلەولا هات، ئەو کات ئەو شارە کوردییانە لە ژێر دەسەڵاتی ساسانییەکاندا بوون، لە ئەنجامی شەڕێکی

خوێناوی موسلمانەکان سەرکەوتن، و ئەو لەشکرە لە دوای لەشکری بەزیووی ساسانییەکان بوو تا گەیشتە حەلوان واتە قەسری شیرین لە ساڵی (١٧ك / ٦٣٨ز) هەندێك سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کە فەرماندە هاشم کوری عەتەبە کوری ئەبی وەقاص توانی بندنیجین (مەندەلی) دەست بەسەردا بگرێت، و بەڵێنی بە دانیشتوانی دا کە سەر و سامان و گیانیان بپارێزرێت، بەمەرجێ سەرانە بدەن، و لە دوایدا توانیان دەست بەسەر دقوقا (داقوق) و خانیجار (دوزخورماتو) پاشانیش کورة باجرمی (کەرکوك)دا بگرن.

لەشکرێکی تر بە فەرماندەی (جەریر کوری عەبدوللا بجلی) بەرەو خانەقین چوو، و لەدوای ئەوەی کە دەستیان بەسەر خانەقین داگرت، ئەو لەشکرە بەرەو حەلوان چوو، کە لە ساڵی (١٩ك / ٦٤٠ز) دەستی بەسەردا گیرا بەهۆی بەستنی ئاشتی لە نێوان کوردەکان و موسڵمانەکان ناوچەکانی موسڵ و بادینان و هەولێر و شارەزوریش لەسەر دەستی عوتبە کوری فەرقەد فەتح کرا.

لەشکرێکی تر بە فەرماندەی (ئەبو موسا ئەلئەشعەری) کە پێکهاتبوو لە دانیشتوانی بەسرە، توانی لە رێگای نەهاوەندەوە بەرەو شاری دینەوەر بچێت لە ساڵی (٢٠ك / ٦٤٢ز) دەستی بەسەردا بگرێت و لەدەست ساسانییەکان دەربهێنێت لە سەرەتادا ئەو دەست بەسەرداگرتنە بەهۆی شەڕ بووە، بەڵام دوایی برپاریان دا کە سەرانە بدەن بە موسڵمانەکان و لە سەرئایینی خۆیان بمێننەوە لەشەڕی نەهاوەند (٢١ك/٦٤٣ز) کە لەسەر خاکی کوردان ڕووی دا موسڵمانان سەرکەوتنی یەکجارەکییان بەسەرکردایەتی (النعمان بن مقرن المزنی) بەسەر ساسانیەکان بەدەست هێنا، کە (فەیروزان) سەرکردایەتی دەکردن، ئەم شەڕە بە (شەڕی سەرکەوتنی سەرکەوتنان) ناسراوە.

## دەست بەسەرداگرتنی میسر لە (٢٠ك / ٦٤٠ز)




دوای ئەوەی کە بەشێکی زۆر لە ولاّتی شام و عێراق دەستی بەسەرداگیراوە لە ڕۆمەکان و ساسانییەکان سەندرا، بە بڕیاری خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) لەشکری بەرەو میسر چوو بە فەرماندەی (عمرو بن عاص)، بیابانی سینایان بڕی و هەندێك شاریان بەبێ شەڕ دەست بەسەردا گرت، وەك شاری عەریش، موسڵمانەکان تووشی هیچ شەڕێك نەبوون تا گەیشتنە شاری فەرما (الفرما) شارێکی کۆن و شوورەداری بەهێز بووە، وە بەندەرێکی هەڵکەوتووش بووە لەسەر ڕۆخی ڕووباری نیل.

موسڵمانەکان ئەو شارەیان گەمارۆ دا، بۆ ماوەی مانگێك زیاتر، دوایی توانیان دەستی بەسەردا بگرن و ئینجا شاری بابلیۆن (مەڵبەندی سوپای بیزەنتییەکان) و شاری ئەسکەندەریە گیران دوا جاریش ناوچەی فوستات بوو کە موسوڵمانان ئاوەدانیان کردەوە، ئەو شارەش بوو بە بنکەی سەربازی ئیسلامی و پایتەختی میسر.

## پرسیارەکانی بەشی دووەم

پ١/ پێناسەی ئەمانە بکە: ١/ خەلیفە، ٢/ هەڵگەڕاوە، ٣/ شەڕی فتوحات، ٤/ یەرموك، ٥/ شەڕی قادسیە، ٦/ دیـــوان، ٧/ والی، ٨/ خەوارج.

پ٢/ باس لە ڕۆڵی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێت) بکە لە شەڕی فراوان خوازیدا.

پ٨/ بە کورتی باسی لە دەست بەسەرداگرتنی قودس بکە.

نیشانەی ڕاست لەبەردەم پرسیاری ڕاست و نیشانەی چەوت لەپێش پرسیاری چەوت دابنێ و چەوتەکانیش ڕاست بکەوە.

١/ یەکەم کەس لە پیاوان کە باوەڕی بە پێغەمبەر (د.خ) هێناوە خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب بووە.

٢/ ئەبو بەکری سەدیق بە دووەم خەلیفەی موسڵمانان دادەنرێت.

٣/ شەڕی هەڵگەڕاوەکان لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب بوو.

٤/ تاکە هۆی بزوتنەوەی هەڵگەڕاوەکان نەدانی زەکات بوو.

٥/ موسڵمانەکان لە سەرکوت کردنەوەی هەڵگەڕاوەکان سەرکەوتوو نەبوون.

# بەندی سێیەم

# کوردستان لە سەردەمی ئیسلام

## یەکەم/ کوردستان و یەکەمین پەیوەندی کورد بە ئیسلام:-

ئایینی پیرۆزی ئیسلام کە لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایینی لە نیمچە دوورگەی عەرەبی دەرکەوتوو پەرەی سەند، دواتر لە ڕێگەی باوەڕداران و لەشکرکێشی ئیسلامی، گەیەنرایە دەرەوەی نیمچە دوورگەی عەرەب، ناوچە دوای ناوچەی وە لەنێو گەلانی جیاوازدا بڵاو بووەوە: میللەتی کورد یەك لەو میللەتانە بوو کە زوو بە ئایینی ئیسلام ئاشنا بوو بڕوای پێ هێنا. پەیوەندی کورد بە ئیسلامەوە لە دوو ڕێگاوە بووە کە ئەمانەن:

١- پەیوەندی کەسی و سنووردار کە خۆی لە هەڵوێستی (جابانی کوردیدا) دەبینێتەوە، کە وەکو کوردێك بە خزمەت پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) گەیشتووەو بڕوای بە پەیامەکەی هێناوە وەکو یەك لە یاوەران ناسراوە، کوڕەکەشی کە بە ئەبو بەسیر بەناوبانگ بووە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە (ڕیوایەتی کردووە).

٢- پەیوەندی فراوان و ڕاستەوخۆ: کە لەسەر خاکی کوردستان هەر لەگەڵ هاتنی سوپای موسڵمانان لە ساڵی ١٦ی کۆچی دەستی پێکردووە تا ساڵی ٢٥ی کۆچی خایاندووە، کە زۆربەی زۆری کوردستان کەوتە بەر دەستی سوپای ئیسلام، بەڵام قایل بوونی کوردان بە ئیسلام و وەرگرتنی بنەماکانی هەر لەو ماوەیە دا نەبوو. بەڵکو دواتر چەندان ساڵ بە شێنەیی درێژەی هەبوو.

## دووەم/ کاریگەری فتوحاتی ئیسلام بۆ سەر کوردستان:

دەتوانین بە پوختی کاریگەرییەکانی لەشکرکێشی ئیسلام بۆ سەر کوردستان لەم چەند خاڵەدا بخەینە ڕوو:

١- لە لایەنی بیرو باوەڕی ئاینییەوە: بوو بەهۆی دەست پێکی قۆناغێکی نوێ لە مێژووی کوردستان. کە تێیدا زۆربەی میللەتی کورد بەرە بەرە لە ئایینەکانی پێش خۆیان (زەردەشتی، مەسیحی، جولەکایەتی،......هتد) تەکینەوەو بڕوایان بە ئایینی ئیسلام هێنا، بەمەش بنەماو زەمینەیەکی نوێ لە لایەنی ڕەوشتی و جیهانبینی و مامەڵەی مرۆیی ...... هتد، بۆ پێکهێنان.

٢- لە لایەنی سیاسی: دەسەڵاتی ئیسلام لە ناوچەکەدا چەسپاو لەوێدا کۆتایی هێنرا بە دەسەڵاتی ساسانی و بێزەنتیان کە کوردستانیان بۆخۆیان پاوان کردبوو، بەمەش ڕێ خۆش بوو بۆ دەرکەوتنی دەسەڵاتی خۆ جێی لە کوردستاندا.

٣- لە لایەنی ئابوورییەوە بوو بەهۆی بەستنەوەی کوردستان بە دەوڵەتێکی زلهێز (دەوڵەتی ئیسلامی)، بەمەش کرانەوەی بۆ کوردستان لێکەوتەوەو پەیوەندییە ئابوورییەکان بە تایبەتی بازرگانی گەشەی کردوو پیشەو کاری کشتوکاڵی بوژانەوەی تێکەوت.

٤- لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە: پاش ئەوەی کوردستان بوو بە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی ئیدی تێکەڵاوی لە نێوان کوردو میللەتانی دیکەی موسڵمان بە تایبەتی عەرەب زیاتر بوو، کۆمەڵێك خێڵ و عەشیرەتی عەرەبی لە کوردستان نیشتەجێ بوون، تێکەڵاوی لە نێوان ئەوان و کورداندا بوو، هەروەها لە لایەنی دانیشتوانەوە ڕێژەی عارەبان لە

کوردستان زیادی کردو هەندێك شوێنی ئاوەدانی کوردستانیان بەنێوی خۆیانەوە ناو نا.

**چالاکی/**

گرووپێك لە قوتابیان بە پەنابردنە بەر ئەتڵەس و سەرچاوەکان بەیارمەتی مامۆستا .. نەخشەی فراوانخوازی ئیسلام لە کوردستان ئامادە دەکەن.

## هەرێمە کوردییەکان لە سەردەمی ئیسلام

لە سەروبەندی پەیدابوونی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ولاتی کوردان ناوێکی دیارکراوی نەبوو کە بۆ هەموو ولاتی کوردەواری بەکاربێ، گەشتیارو ولاتناسی موسلمان بەو جیهانبینییەو کە هەیان بوو قەڵە مرەووی ئیسلامیان بۆ چەند هەرێمێك پۆلێن کردووە، جا لەبەر ئەوەی خاکی کوردان ئەو حەلە زۆرتر لە شەش هەرێمدا جێی کردۆتەوە بەم شێوەیە:-

### ١- هەرێمی چیاکان:

بە ناوچەیەکی پان و پۆڕی بە کێوو زەنوێر دەگوترا، کە لای ڕۆژهەلاتی هاوسنووری خۆراسان و هەرێمی فارس و ئەسفەهان بوو. لە ڕۆژئاوای دراوسێی ئازربایجان و جەزیرە لە عێراق بوو، بەلام لای باکووری، تخوبی لەگەڵ هەرێمەکانی دیلەم و گەیلان دەهاتەوە لە باشووریش هەرێمی خۆزستان و بەشێکی عێراقیان پێك دەهێنا.

ناوەڕاستی بەشی ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان کوردنشین بوو لە کۆندا بە ناوچەی (میدیا) ناونرابوو، دیارترین شارەکانی: دینەوەر، قرماسین واتە(کرماشان) حەلوان، شاپورخواست، شارەزوور، نەهاوەند.

بەناوبانگترین ئەو هۆزە کوردییانەی لەوێ نیشتەجێ بوون:- بەرزیکانی، شازەنجانی، جورقان (گۆران)، ماجەردانی.

### ٢- هەرێمی ئازربایجان:

ئەو هەرێمە کە بەشێکی زۆری کوردنشین بوو، لە باشووردا هەرێمی چیاکان و لە باکووردا ڕووباری ئاراس و لە ڕۆژهەڵاتی هەرێمەکانی دەیلەم و گەیلان و لە ڕۆژئاوا ئەرمینیاو بەشێکی جەزیرە هەرێمەکانیان پێکدەهێناو لە کۆندا پێیان دەگوت (ئەتروپاتەکان) یاخود (ئاتروپاتین).
بەناوبانگترین شارەکانی هەرێمی ئازربایجان. تەبرێز، مەراغە، شنۆ، ورمێ.
دیارترین ئەو هۆزە کوردانەی لەوێ نیشتەجێ بوون: هەزبانی، زرزاری، جەلالی، سۆلی.

### ٣- هەرێمی جەزیرە:

بەزووروی وڵاتی میسۆپۆتامیا دەگوترا بە تایبەتی ئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان هەردوو ڕووباری دیجلەو فورات کە سنووری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای هەرێمەکە پێکدەهێنن، هەردوو شاری هیت و تکریت لە باشوورو ئەرمینیاو وڵاتی ڕۆم لە باکوور هاوسنووری هەرێمی جەزیرە بوون.
شارە بەناوبانگەکانی جەزیرە ئەمانەن: هەولێر، موسڵ، ئامەد، روها، میافارقین، رأس العين، جەزیرەی بۆتان.
زۆربەی زۆری هەرێمی جەزیرە کورد بوون و بە تایبەت کە هۆزە ناسراوەکانی: بەشنەوی، حاربوختی، هەزبانی، جوبی، حەمیدی لێبوون.

### ٤- هەرێمی ئەرمینیا:

بەشی باکوورو ڕۆژهەلاتی ولاتی کوردان لە لای ولاتناسانی ئیسلامی دەکەوێتە هەرێمی ئەرمینیاوە کە لە لای باکوورەوە ولاتی گورج و لە باشووردا ئازربایجان و جەزیرەو لە ڕۆژهەلاتدا هەرێمی ئاران و لە ڕۆژئاوادا ولاتی ڕۆم و باکووری جەزیرە سنوورەکان پێکدەهێنن، لە شارە بەناوبانگەکانی هەرێمی ئەرمینیا، ئانی، دبیل، بەدلیس، خەلات، وان. دیارترین هۆزو تیرە کوردیەکانی ئەرمینیا، ڕۆژەکی، ڕەوادی، بوختی، زومان و کردکی.

### ٥- هەرێمی خۆزستان:

یەك لەو هەرێمە سنووردارانەیە کە لە ناوەڕاست و باکووری دا کوردێکی زۆر هەبوون، لە لای باکوورییەوە ناوچەکانی کوردستان و هەرێمی چیاکان، لای باشووری ناوچەکانی عەبادان و (کەنداو)ە. لە لای ڕۆژهەلاتییەوە هەرێمی فارس و لە ڕۆژئاوای دا عێراق سنوری هەرێمی خۆزستانیان پێکدەهێنا. شارە بەناوبانگەکان: ڕامهورمز، جندیشیاپور، ئەهواز.

جگە لەو هەرێمانەی کە باسکران کورد لە چەند ناوچەی دیکەی ڕۆژهەلاتی دەولەتی ئیسلام هەبوون دیارترینیان هەرێمی فارسەکە دەکەوێتە خوارووی ئێرانی ئێستا، شارەکانی شیرازو دارابجرد و ئەستەخر، لە گرنگترین ئاوەدانیەکانی هەرێمی فارس بوون کە کوردیان لێ بوو، بە گوتەی مێژوو نووسان لەو هەرێمەدا پێنج سەد هەزار مالی کوردان هەبووە کە پێیان دەگوترا زووم یان زمومی کوردان.

## ڕاپەڕینە کوردییەکانی سەردەمی ئیسلامی :

دوای ئەوەی ئایینی ئیسلام لە نێو کوردان بڵاو بووەوە. کورد بوون بە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی و ڕاستەوخۆ کەوتنە ژێر کاریگەری مامەڵەی سیاسییانەی دەوڵەتی ئیسلامی لەدوای یەکەکانی (ڕاشدی، ئومەوی، عەبباسی) جار بەجار لە هەندێك شوێنی کوردستاندا ڕاپەڕین دژی دەسەڵاتدارانی ئومەوی و عەباسی کران، ئەو ڕاپەرینانە لە دوو شێوازدا خۆیان دەنواند:

١- بەشداری کورد لە ڕاپەڕین و بزاڤەکانی وەکو خەواریج، عەلەوییەکان ........ هتد.

٢- ڕاپەڕین و بزاڤی تایبەتی کوردی کە دژی دەسەڵاتداران کراوە: و بە پوختی لەبارەی هەر یەکێکیان دەدوێین:

### ١- بەشداری کورد لە بزاڤەکانی خەوارج و عەلەوییەکان:

خەوارجەکان گرووپێکی ئایینی سیاسی ئیسلامی بوون کە لە ململانێی نێوان خەلیفە عەلی کوڕی ئەبی تاڵب (خوا لێی ڕازی بێت) موعاویە کوڕی ئەبو سوفیان لایەنگری شتاقیان نەبوون دەیانگوت حوکم کردن تەنها بۆ خوایە، بەخۆیان دەگوت شوراتەکان هەر پاش دەرکەتنیان پەنایان بۆ شارەزوور بردو لەوێدا دژایەتی خۆیان بۆ ئومەوییەکان دەربڕی دیارە هەندێك لە کوردەکانی شارەزوور لایەنگری خەوارجەکانیان دەکرد، هەروەها لە سەردەمی عەباسییەکاندا کورد لە چەند بزووتنەوەی خەوارجەکاندا دژی عەباسییەکان بەشداریان کردووە کە بەناوبانگترینیان بزووتنەوەی مساوری کوڕی عەبدولحەمیدی شاری بوو لە ساڵی ٢٥٢کۆچی ٨٦٦زایینی کە لە ناوچەکانی جەزیرە سەری هەڵداو

کوردەکانی دەوروبەری موسڵ و شارەزوور بەشدارییان تێدا کردووە وسەرکەوتنی بەرچاویان لە دژی عەباسییەکان بەدەست هێناوە، سەرکردەی دیاری کوردان لە نێو ئەو بزووتنەوەیەدا محەمەد کوڕی خورزادی کوردی بووە.

بەڵام عەلەوییەکان کە پێشەواکانیان لە بەرەبابی پێغەمبەر (د.خ) بوون پێیان وابوو کە بۆخۆیان شایستەی ئەوەن ببن بە خەلیفە نەك ئومەوی و عەباسییەکان، بۆیە لە ڕەوتی مێژووی ئیسلامیدا بزاڤی عەلەوییەکان بەردەوام بووە هەندێك جار کورد بەهۆی سۆزو دڵگەرمییەك کە بۆ عەلەویەکانیان هەبوو، یان بۆ نیشاندانی نارەزایی خۆیان لە دژی دەوڵەت بەشدارییان لەو جۆرە بزووتنەوانەدا کردووە.

لەساڵی ١٢٢کۆچی کوردەکانی شارەزوور بەشدارییان لەو ڕاپەڕینەی عەلەوییەکان کردووە کە بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی عەلی لەدژی ئومەوییەکان بەرپابووە، هەر وەکو کورد لە سەردەمی عەباسییەکانیشدا لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی کۆچی، نۆیەمی زایینی بەشدارییان لە بزووتنەوەیەکی عەلەوییەکان لە ناوچەکانی ئازربایجان کردووە.

هەروەها قەرامیتەکان کە گرووپێکی عەلەوی بوون لە نیوەی دووەمی سەدەی سێیەمی کۆچی لە ناوچەکانی کوفە دەرکەوتن، ئەوانیش لەنێو کورداندا لایەنگریان هەبووەو سەرکردە جەعفەری کوڕی حەمیدی کوردی لە ڕابەرانی ئەو بزووتنەوەیە بووە.

## ٢- ڕاپەڕین و بزاڤی تایبەتی کوردی:

ئەو ڕاپەڕین و سەرهەڵدانانەکە لە دژی چەوساندنەوەو بێ ئاگاییو بێ سەروبەری دەسەڵاتی عەباسییەکان لە نێو کورداندا باویان سەندوەو

خودان زەمینەو ئامانج بوون و سەرکردەی بە وەج و دلێر فەرماندەو ئاراستەکەری ئەو ڕاپەڕینانە بوون. کە لە دیارترینیان ئەمانەن:

**چالاکی/**

گرووپێك لە قوتابییان پەخشێکی سەر دیوار ئامادە دەکەن، باس لە ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی کورد لە سەردەمی خەلافەتی ئیسلامی دەکەن.

### أ- ڕاپەڕینی کوردەکانی دەوروبەری موسڵ:

لە ساڵی ٢٢٤کۆچی / ٨٣٩ زایینی کوردەکانی ڕۆژهەلاتی موسڵ لە دژی دەسەلاتدارانی عەباسی لە ناوچەکە دا ڕاپەڕین. سەرکردەی ڕاپەڕین جەعفەر کوڕی میر حەسەنی کوردی بوو، کە لە دژی چەوساندنەوەو ستەم و کەلەکەبون والییەکانی عەباسی لە ناوچەکەدا دەکرا.

چیای داسن مەلبەندی بەرخودانی کوردانی ڕاپەڕیو بوو خەلیفەی ئەو کاتەی عەباسییەکان ئەلموعتەسەم دەرکی بە مەترسی ڕاپەڕینەکە کردووە، سەرکردەیەکی بە ناوی عەبدوللای ئەزدی بۆ سەرکوتکردنی ڕاپەڕیوەکان ڕەوانەی موسڵ کرد، کە لە چیای داسن دا لەگەل کوردان جەنگاو سوپاکەی شکستی هێناو بۆ خۆشی واتا (عەبدوللای ئەزدی) کوژرا.

ئەو ڕاپەڕینە تا ساڵی ٢٢٧کۆچی / ٨٤٢زایینی بەردەوام بوو لەو ساڵەدا لە بەرامبەر لەشکری زۆرو زەبەندی عەباسییەکان کوردە ڕاپەڕیوەکان پاشەکشەیان کردو ئومێدی سەرکەوتنیان کەم بۆوە، بۆیە سەرکردە جەعفەر خۆی نەدا بە دەستەوە و خۆی ژەهر خواردوو کرد.

### ب- بزووتنەوەی شەدادی کوردی:

ناوچەی حەسەینە (زاخۆ) و بۆتان لەساڵی ٢٨١کۆچی / ٨٩٤زایینی بە سەرکردایەتی شەدادی کوردی، لە بەرامبەر دەسەڵاتدارانی عەباسی ناوچەکە ڕاپەڕین، کوردێکی زۆر لەو بزووتنەوەیەدا بەشدارییان کردووەو ژمارەیان بە دە هەزار کەس مەزندە کراوە، لەبەرئەوەی مەترسی ئەو ڕاپەڕموە زۆر بووە، بۆیە خەلیفەی عەباسی ئەلموعتەزید بۆخۆی ڕاپەڕیوە کە سەرکردایەتی سوپای عەباسییەکان بکاو توانی کۆتایی بەو ڕاپەڕینە بێنێت.

## میرنشینە کوردییەکان:

لە سەدەی چوارەمی کۆچی و دەیەمی زایینی بزاڤی سەربەخۆیی کوردان گەشەی بەرچاوی کردو دروست بوونی چەند میرنشینێکی لێکەوتەوە، کە هەر یەکەیان خودان سەروەری خۆیان بوون و سەرکەوتووانە خزمەتی وڵاتی کوردەواریان کردووە.

## میرنشینە کوردییەکانی سەردەمی ئیسلامی:

### ١- میرنشینی ڕەوادی:

لە دەوروبەری ساڵی ٣٣٧کۆچی/ ٩٤٨زایینی میرنشینی ڕەوادی لە هەرێمی ئازربایجان لەسەر دەستی میر محەمەد کوڕی حوسێن دامەزراوە کە سەرکردەی عەشیرەتی ڕەوادی کوردی بووە، توانیویەتی دەسەڵاتی خۆی بچەسپێنێ و لە ئازربایجان فراوانخوازی بکات.

## بەناوبانگترین میرەکانی میرنشینەکە :

میر حسێن کوڕی محەمەد (ئەبولهەیجای ڕەوادی) کە لە ساڵی ٣٤٥کۆچی/ ٩٥٦زایینی شاری تەورێزی گرت و دوایی کردیە پایتەختی میرنشینەکەی.

= میر ئەبولهەیجای دووەم کە توانی هەموو ئازربایجان بخاتە سەر قەڵەمڕەوی میرنشینەکەی و هێرش بکاتە سەر ئەرمینیا، زۆر پەرەی بە ئاوەدان کردنەوەو خزمەتی زانستی و فێربوون داوە.

## ٢- میرنشینی شەدادی:

ئەو میرنشینە کوردییە لە سەروبەندی ساڵی ٣٤٠ کۆچی / ٩٥١ زایینی لە ناوچەی ئاران کە دەکەوێتە نێوان هەردوو هەرێمی ئازربایجان و ئەرمینیا لەودیوی ڕووباری ئاراس دەرکەوتووە.

شەدادییەکان بنەماڵەیەکی کورد بوون لە عەشیرەتی ڕەوادی سەردارپان محەمەد کوڕی شەداد بە دامەزرێنەری میرنشینەکە دادەنرێت، کە یەکەم جار لە شاری دبیل سەری هەڵدا.

## بەناوبانگترین میرەکانی میرنشینی شەدادی

جگە لە میر محەمەد کوڕی شەداد دیارترین میرەکانی شەدادی ئەمانەبوون:

١- میر لەشکری کوڕی محەمەد کە ماوەی هەشت ساڵ حوکمی کردووەو میرنشینەکەی فراوان کردووەو زۆر شارو ناوچەی خستۆتە سەر.

٢- میر فەزلۆن کوڕی محەمەد کە ماوەی (٤٥) ساڵ میرایەتی کردووە زۆر بەتەنگ باش کردنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی میرنشینەکەی بووەو گرنگی بە چاککردنی ڕێگاو بانەکان داوەو پردی لەسەر ڕووباری ئاراس.

لە ساڵی ٤٢٢کۆچی / ١٠٣١ زایینی میر شاور ئەبو سوار کوردی فەزلۆن فەرمانڕەوایی شەدادی دەکرد کە یەك لە میرە مەزنەکانی شەدادییەکان

به پیاوێکی دادپەروەرو ئازا ناسراوە لە سەردەمی وی دا سەلجوقییەکان شالأویان بۆ سەر وولأتی هێناوە.

دەسەلأتی شەدادییەکان پاش ئەوەی لە ناوچەی لاوازبوو سەلجوقییەکان مەترسییان لەسەری دروست کرد، بەرە بەرە لە هەرێمی ئەرمینیا بەهێز دەبوو بۆیە پایتەختی میرنشینەکە گوێزرایەوە بۆ شاری ئانی لە ئەرمینیا و لەوێش چەندان میری بەناوبانگ میرایەتیان کردووە و دەسەلأتی شەدادییەکان هەتا ساڵی ٥٩٥کۆچی بەردەوام بووەو بە دەستی مەغۆلەکان رووخاوە.

### ٣- میرنشینی حەسەنوەیهی :

ئەو میرنشینە لەسەر دەستی میر حەسەنوەیهی کوڕی حوسێنی کوردی دامەزراوە کە سەرۆك خێڵی بەرزیکانی بوو لە هەرێمی چیاکان.

مێژووی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٣٤٨کۆچی/ ٩٥٩زایینی شاری (شاپورخواست) لە ناوچەی لوڕستان پایتەختی میرنشینەکە بووە.

## لە میرە بەناوبانگەکانیان

میر حەسەنوەیهی کە هەتا ساڵی ٣٦٩کۆچی/ ٩٧٩زایینی میرایەتی کردووەو زۆر ژیرانە پەیوەندییە سیاسییەکانی لەگەڵ بوەیهییەکان پەرە پێ داوەو توانیویەتی هۆزو ناچەی کوردی جیا جیا بخاتە سەر میرنشینەکەی.

میر بەدر کوڕی حەسەنوەیهی کە دوای باوکی دەسەلأتی گرتە دەست زۆر میرێکی هێژاو بەکار بوو، سەنگێکی سیاسی بەرچاوی لە ناوچەکەدا هەبووە، زیاتر لە سی و پێنج ساڵان میری میرنشینەکە بوو پیاوێکی دلێرو مەردو خێرخواز بوو، لە سەردەمی حوکمی ئەو دا ناوچەکانی لوڕستان و دینەوەرو

کرماشان و هەمەدان و شارەزوور شارو ئاوەدانی دیکەی وڵاتی کوردەواری بوژانەوەو فراوانبوونیان بەخۆوە دی.

میرنشینی حەسەنوەیهی دوای مەرگی میر بەدر لە ساڵی ٤٠٥کۆچی/ ١٠١٤زایینی بەرەو لاوازی چوو دواین میر تاهیری کوڕی هیلال کوڕی بەدر بوو تەنها بۆ ماوەی یەك ساڵ میرایەتی کردوو لە ساڵی ٤٠٦کۆچی / ١٠١٥زایینی دەسەڵاتی میرنشینەکە کۆتایی هات و میرنشینی عەنازی شوێنی گرتەوە.

## ٤- دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەڕوانی:

ئەو دەولەتە لە ناوچەی دیاربەکر لە دەوروبەری ساڵی ٣٧٣کۆچی / ٩٨٣زایینی وەکو دەسەڵاتێکی سیاسی دیار دەرکەوتووە، دامەزرێنەری دەولەتەکە میر باد کوڕی دۆستەکی کوردییە کە توانیویەتی جگە لە ناوچەکانی دیاربەکر هەندێك شار لە هەرێمی ئەرمینیاش بخاتە بن دەستی خۆی بۆ ماوەیەك فەرمانڕەوایی شاری موسڵیشی کردووە.

میر باد لە ساڵی ٣٨٠کۆچی / ٩٩٠زایینی کۆچی دوایی دەکات و دوای خۆی خوارزایەکانی جێگای دەگرنەوەو بەم شێوەیە بەرەبابی مەروانی دەبن بە میرانی دەوڵەتەکە.

**ڕاهێنان**

بەناوبانگترین میرنشینە کوردییەکان، میرنشینی

| | | |
|---|---|---|
| ڕەوادی | و | و |
| و | و | |

## بەناوبانگترین میرەکانی دەوڵەتی دۆستەکی ـ مەروانی

= میر ئەبو عەلی کوڕی مەروان کە زۆر لێوەشاوە بوو توانی لێزانانە جێگەی خاڵی (باد) بگرێتەوەو شار بەشارو ناوچە بە ناوچە بخاتەوە بن دەستی خۆی.

= میر مومەهەد ئەلدەولەی کوڕی مەروان کە لە ساڵی ٣٨٧کۆچی / ٩٩٧زایینی بوو بە میری دەولەتەکە توانی دەسەلاتی بەهێز بکاو لە لایەن هێزە دیارەکانی ناوچەکە (بێزەنتی و بوەیهییەکان) دان بە دەسەلاتەکەی دانراوەو خزمەتێکی بەرچاوی کردووە لە بواری ئاوەدان کردنەوەو پەرەدان بەزانست و زانیاری.

= میر نەسرول دەولە ئەحمەد کوڕی مەروان کوڕی یەك لە میرە هەرە بەناوبانگەکانی کوردە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا لە ساڵی (٤٠٢ – ٤٥٣کۆچی / ١٠١٢ – ١٠٦١زایینی) حوکمی کردووەو لە سەردەمی ئەودا دەوڵەتەکە لە بالاترین قۆناغەکانی گەشەکردنی سیاسی و شارستانی دا بووە کارەکانی لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامی دا دەنگیان داوەتەوە خودان سوپایەکی بەهێزو دام و دەزگای کارگێرییانەی دەولەتی بووە وەزیرو ڕاوێژکارو جێگرو والی بەکاری هەبوون.

دوای هاتنی سەلجوقییەکان بۆ هەرێمەکەو داگیرکردنی دیاربەکرو دەوروبەری دەولەتی دۆستەکی ـ مەروانی بە قۆناغێك لە لاوازی دا تێپەڕی و تا لە ساڵی ٤٨٩کۆچی / ١٠٩٦ زایینی بە تەواوی کۆتایی بە دەسەلاتیان هات بەدەستی سەلجوقیەکان.

## ٥- میرنشینی عەنازی:

ئەو میرنشینە لە ناوچەی حەلوان لە نێو کوردانی هۆزی شازەنجانی دەرکەوت و پەرەی سەند تا وای لێهات دوای نەمانی میرنشینی حەسەنوەیهی بو بە میراتگری و لە هەمان ئەو شوێنانەی کە حەسەنوەیهییەکان تێیدا بالاّ دەست بوون.

## بەناوبانگترین میرەکانی میرنشینەکە:

- میر ئەبولفەتح محەمەدی کوڕی عەناز کەمیری یەکەمیانەو لە ساڵی (٣٨١ - ٤٠١ کۆچی / ٩٩١ - ١٠١٠زایینی) میرایەتی کردووە دەسەلاّتی خۆی گەیاندە خانەقین و سەرووی بەغدا. زۆر بە تەنگ ئاوەدانکردنەوەو پاراستنی وولاّتەکەیەوە بووە.

- میر حیسام ئەلدەولە کوڕی ئەبولفەتح کە دوای باوکی میرایەتی کردووەو توانیویەتی درێژە بە ڕێبازی باوکی بدات لە خزمەتکردن و پەیوەندی دروستکردن لەگەڵ هێزەکانی ناوچەکە، بەلاّم ماوەی حوکمی میر حسام ئەلدەولە سیی و شەش ساڵی خایاندووە لەو ماوەیەدا شەڕو ناکۆکی نێوخۆیی و دەرەکی کاریگەری خراپی لەسەر میرنشینەکە دانا.

لە ساڵی ٥١١کۆچی / ١١١١زایینی کۆتایی هات.

## ٦- میرنشینی هەزبانی:

هۆزی هەزبانی کە یەك لە هۆزە هەرە گەورەو دیارەکانی کوردە لە سەردەمی ئیسلامدا. تێبینی دەکرێ کە شاری هەولێر یەك لە پێگە بەهێزەکانی هەزبانییەکان بووە، بۆیە هەر لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچی (یازدەمی زایینی)، لە هەولێرو دەوروبەری) میرنشینی هەزبانی دامەزراوە کە دەسەلآتی هەتا سالّی ٥٣٤کۆچی / ١١٣٩ زایینی خایاندووە ئەو قۆناغە لە مێژووی ناوچەکەدا ئەلْقەیەکی گەشەداری دیرۆکی قولّ و ڕیشاژۆی هەولێر پێکدەهێنێ.

**چالاکی/**

گروپێك لە قوتابییان (ڕاپۆرتێك) ئامادە دەکەن کە لە دوو لاپەڕە پێکبێت لەمەڕ دوو میرنشین .. لە پێش قوتابییان ڕاپۆرتەکە دەخوێننەوەو گفتوگۆ پرسیار لەبارەیەوە دەکرێت.

**بەناوبانگترین میرەکانی هەزبانی لە هەولێر:**

- عیسای کوڕی موسای هەزبانی.
- سالار کوڕی موسای هەزبانی.
- ئەبولحەسەن کوڕی موسکی هەزبانی.
- ئەبولهەیجای هەزبانی کە میرێکی بەهێز بووەو توانی دەسەلآتی خۆی لە ناوچەکەدا بچەسپێنێ، پەیوەندی دۆستانەی لەگەلّ سەلجوقییەکان هەبووە.

## دەوڵەتی ئەیوبی

یەك لە بەناوبانگترین دەوڵەتە کوردیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و سەردەمی ئیسلامی دەوڵەتی ئەیوبیە، کە بنەماڵەی ئەیوبیەکان دایانمەزراندووە، ڕەسەنی ئەیوبیەکان دەگەڕێتەوە بۆ کوردە ڕەوادیەکان کە لە خانەدانترین تیرە کوردیەکانی ئەو سەردەمە بوون و زێدیان شارۆچکەی (دوین) بووە لە ناوچەی قەفقاس لە باکوری کوردستان، ئەم بنەماڵەیە سەردەمانێك ناوچەی خۆیان بەجێدێڵن و دواتر لە تا لە شاری تکریت دەگیرسێنەوە، پیاوی هەرەدیاریان ئەو حەڵە نەجمەدین ئەیوب و شێرکۆی برای بوون، کە دەسەڵاتدارانی ناوچەکە ڕێزیان لێگرتوون.

بەڵام پاش ماوەیەك ناچاردەبن ئەوێش بەجێبهێڵن و لە شاری موسڵ جێگیر دەبن و لەلایەن بنەماڵەی فەرمانڕەوای زەنکیەکانەوە بە حورمەتەوە وەخۆدەگیرێن و لەبەر لێهاتوویی و کارامەیی و دڵسۆزیان لە نێو دام و دەزگاکانی دەوڵەتدا پلەو پایەی جیاجیا وەردەگرن: نەجمەدین ئەیوب دەبێتە سەرداری شاری (بەعلەبەك) و ئەسەدەدین شێرکۆ دەبێتە سوپاسالاری زەنکیەکان و بەمەش ئەیوبیەکان بەرەبەرە بوونە هەمەکارەو خودان دەسەڵات، تاوەکو توانیان دەسەڵاتی زەنکیەکان بگەیەننە (میسر) و لەوێ جگە لە شێرکۆ ڕۆڵی (یوسف کوڕی نەجمەدین ئەیوب) دەردەکەوێ کە دواتر بە سەلاحەدینی ئەیوبی دەناسرێ کە توانی ساڵی ٥٦٧ك کۆتایی بە دەوڵەتی (فاتمییەکان) بهێنی بەردی بناغەی دەسەڵاتی ئەیوبیەکان لە میسر دابنێ، وە دواتر لەگەڵ پوکانەوەی دەسەڵاتی زەنگییەکان لە ٥٦٩ — ٥٧٠ك سەلاحەدین توانی دەوڵەتی ئەیوبی سەربەخۆ دابمەزرێنێ و بەرە بەرە فراوانخوازی کردو قەڵەمڕەوی گەیشتە وولاتی شام و بەشێکی جەزیرەو

هەندێك ناوچە لە حیجازو خواروی یەمەن و بەشێکی دیار لە باکوری ئەفریقیا. بەمەش سولّتان سەلاحەدین بەرەیەکی یەکگرتووی ئیسلامی لە دژی خاچهەڵگران پێکهێنا کە ئەو کاتە لە ئەوروپاوە هێرشیان کرد بۆ سەر جیهانی ئیسلامی.

سولّتان سەلاحەدینی ئەیوبی یەکەم سولّتانی ئەیوبیە و لە کەسایەتییە بەناوبانگەکانی کوردە لە مێژوودا، چونکە بەهۆی بەتوانایی و لێهاتووی خۆی توانی بەهێزترین دەوڵەتی ئیسلامی کوردی ئەو سەردەمە دابمەزرێنێ و لە رووبەرووبوونەوە لەگەڵ خاچهەڵگران سەرکەوتنی گەورە بەدەست بێنێ، بە تایبەتی لە **شەڕی (حەتین)** وە ڕزگارکردنی (بیت المقدس) ساڵی ٥٨٣ك وە چەندان شەڕو بەخشندەیی و نواندنی لێبوردەیی و جوامێری و مەردایەتی هەتا لەگەڵ دوژمنەکانیشی دا. ئەمە وێڕای خۆنەویستی و سوارچاکی و ئازایەتیەکەی، کە سولّتان سەلاحەدینی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا ناوبانگی پێ دەرکردبوو، سەلاحەدین لە ساڵی ٥٨٩ك کۆچی دوایی کردووەو لە دیمەشق نێژراوە.

دوای نەمانی سەلاحەدین ململانێ دەکەوێتە نێوان کوڕەکانی و برایەکانی. لە کوڕەکانی سەلاحەدین لە میسر (الملك العزیز) دەبێتە دەسەڵاتدار و لە دیمەشق (الملك الافضل)ی برای سەلاحەدین لە ساڵی ٥٩٦ك دەتوانێ ببێتە سولّتانی ئەیوبیەکان و ناوچە جیاجیاکان دێنێتە ژێر ڕکێفی خۆی. لە سەردەمی ئەویش دا شەڕ لەگەڵ خاچهەڵگران درێژی هەبوو وە چالاکی ئاواکردنەوەو بایەخ دان بەزانست و زانیاری هەر بەردەوام بوو بەڵام دەوڵەتی ئەیوبی هەمان هێزو یەکانگیری و تۆکمەیی سەردەمی سولّتان سەلاحەدینی نەمابوو.

مەلیك عادل لە ساڵی ٦١٥ك کۆچی دوایی کرد و دوای خـۆی مـەلیك (الکامـل) کوڕی بوو بە سوڵتانی دەوڵەتی ئەیوبی، ئەویش توانی درێـژە بـە دەسـەڵاتی ئەیوبیەکان بدات هەرچەندە زیاتر دانوسـتانی لەگـەڵ خاچـهەڵگران دەکـردوو دەیەویست خۆی لەشەڕ بەدوور بگرێت بـەڵام لـە بـواری دەسـەڵات و دەسـت ڕۆیشـتوویی لـە دوای سـوڵتان سـەلاحەدین لـە هـەموو سـوڵتانەکانی دیکـەی ئەیوبی بە هێزتر بوو. مەلیك کامل ساڵی ٦٣٦ك کۆچی دوایی کردوو لە جێـی وی (مەلیك عادلی دووەم)ی کوڕی دانیشت، بەڵام چونکە منداڵ کار و بودەڵـە بوو پشێوی کەوتە ناو دەسەڵاتی ئەیوبیەکان، بۆیە میرانـی دەوڵـەت (مـەلیك صـالح نجـم الـدین ئـەیوبی کـوڕی الکامـل) یـان لـە سـاڵی ٦٣٧ك سـوڵتان و لەسەردەمی دەسەڵاتداریەکەیدا دەوڵەتی لە جاران لاوازتر بوو بە تایبەتی کە ئـەم سـوڵتانە پشـتی لـە سـەرکردە کوردەکـان کـرد کـە بەدرێـژایی مـاوەی فـەرمانڕەوایی ئەیوبیـەکان هـۆزە کوردیـەکانی وەکـو (هـەکاری، هـەزبانی، مەهرانی، زرزاری، ...هتد) پشت و پـەنای دەوڵـەت و هەمیشـە لـە تەنگانـەدا پشـتیان پێدەبەسـترا، وە چـەندان کۆیلـەی (مـەمالیك)ی کـڕین و کردنـی بـە دەسەڵاتدار و سەرکردەی سوپاو بـەم شـێوەیە ئـەوانیش چـونکە بـۆ پـارەو سـامان تێدەکۆشـان، دڵسـۆزی دەوڵـەت نـەبوون و بوونـە هۆکـاری لاوازای و ڕوخانی دەوڵـەتی ئـەیوبی، بۆیـە دوای مردنـی سـوڵتان الملـك الصـالح سـاڵی ٦٤٧ك کە (توران شا)ی کوڕی دەبێتە سوڵتان بارودۆخی دەوڵەتی ئەیوبی لە جاران خراپتر دەبێ بەتایبەتی کە مەمالیك بووبوونـە هەمـەکارەی دەوڵـەت و تاوای لێهات لە ساڵی ٦٤٨ك سوڵتان تورانشا پاش (٦١) ڕۆژ لە فەرمانڕەوایی بە دەستی مەمالیکەکانی خۆی دەکوژرێ و لە دوای خۆی بـو چـەند ڕۆژێکـی کەم (شجرة الدر) کە ژنی باوکی بوو حوکم دەکات و بەم شێوەیە دەوڵەتی لە

میسر کۆتایی پێدێت و دەوڵەتی مەمالیك دادەمەزرێت. بەڵام جێگای ئاماژەیە کە دەسەڵاتی ئەیوبیەکان لە وولاتی شام هەر مابوو تا هاتنی هێرشی مەغۆلەکان لە ساڵی ٦٥٨ك وە لە هەندێك جێگا دەسەڵاتداریەتی بنەماڵە خۆجێیە ئەیوبیەکان بۆ دەیان ساڵ دواتریش هەر فەرمانڕەواییان دەکرد وەکو ئەیوبیەکانی (حەما و حصن کیفا).

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ بڵێین کە دەوڵەتی ئەیوبی نمونەی دەوڵەتی بەهێزو خودان پێگەی ستراتیژی بووە لە سەدەکانی ناوەڕاست دا، بەڵام ململانێی ناوەخۆیی بنەماڵەی ئەیوبی دوای سوڵتان سەلاحەدین و ناکۆکی و مل بۆیەکدی نەدان و دەست تێکەڵکردن لەگەڵ نەیاران و دوژمنان لە دژی یەکتر، لە گرینگترین هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتەکە بوون، ئەمە جگە لە شەڕی بەردەوام لەگەڵ خاچهەڵگران و نەبوونی پلانێکی تۆکمە بۆ پاراستنی یەکانگیری دەسەڵات و وە بوونی چەندان ئاریشەی ئابووری لە نەهاتی و قات و قڕی و وە پشت بەستن بە بێگانەی بە کرێگیراو وەکو مەمالیکەکان و مشور نەخواردن لە سودمەندبوون لە توانای جەنگی جەنگاوەرانی کورد بۆ پاراستنی دەوڵەت لە قۆناغەکانی کۆتاییدا، لە دیارترین هۆکارەکانی ڕوخانی دەوڵەتی ئەیوبین.

## پرسیارەکان

١- جابانی کوردی کێیە؟

٢- دوو خاڵ لە کاریگەری فتوحاتی ئیسلام بۆ سەر کوردستان بژمێرە.

٣- هەرێمی چیاکان چ ناوچەیەکی گرتەوە؟

٤- سێ لە شارە بەناوبانگەکانی هەرێمی(جزیرە) بژمێرە.

# بەندی چوارەم
# سەردەمی دەوڵەتی ئومەوی
# بارودۆخی گشتی دەوڵەت
# دوڵەتی ئومەوی ( ٤١ — ١٣٢ك )

## بنەماڵەی ئومەوی:

ئومەوییەکان سەر بە هۆزی قورەیشن وە، دەوڵەتەکەیان بە ناوی (ئومەییە کوڕی عەبدشەمس کوڕی عەبدولمەناف)ی باپیرە گەورەیانە، خۆی و مامی هاشم کوڕی عەبدولمەناف ڕکابەریان لە سەروەری دەکرد، ئومەوییەکان خاوەن پایەو پلەی بەرز بوون سەرو ماڵێکی زۆریان هەبووە.

## هەڵوێستی ئومەوییەکان بەرامبەر ئیسلام:

ئومەوییەکان هەر لە زووەوەچاویان لە خەلافەت هەبووە بەلآم لە سەردەمی ئەبو بەکرو عومەر بۆیان نەڕەخسا، پاش کوشتنی ئیمامی عومەر و ڕاسپاردنی شەش کەس بۆ دەستنیشان کردنی یەکێك لە نێوانیان ئومێدیان پەیدا کرد.و پاڵپشتی ئیمام عوسمان بوون بە ئاشکراو نهێنی، کە عوسمان دەرچوو کەوتنە کارکردن بۆ دامەزراندنی خیلافەتێکی ئومەوی، ئینجا معاویە بەخۆی کەوت بۆ خۆئامادەکردن و پشت بەستن بە خەڵکی شام.

ئومەوییەکان دوو لقن، لقی (بەنو ئومەییە) و لقی (ئەبیلعاص) زۆربەی خەلیفەکانیان لە لقی دووەمن.

## بەناوبانگترین خەلیفەکانی ئومەوی:

لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی ئومەوی لە ساڵی ٤١ی کۆچی تاکو ڕووخانی لەساڵی ١٣٢ی کۆچی، (١٤) چواردە خەلیفە فەرمانڕەواییان کردووە، بەناوبانگەکانیان:—

## ١- خەلیفە معاویە کوڕی ئەبو سفیان (٤١ – ٦٠کۆچی):

معاویە لە مەککە لەدایك بووە، پاش گرتنی شاری مەککە لە ساڵی ٧ی کۆچی بووە موسڵمان، تەمەنی ٢٣ ساڵ بوو، پێغەمبەر حەزی دەکرد ئەو کەسانەی کە درەنگ ببوون بە ئیسلام لە خۆی نزیکیان بکاتەوە بۆ ئەوەی زیاتر ئیسلام لە دڵیان بچەسپێ بۆیە کردی بە نووسەری وەحی(سروش)، و گێڕەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بووە.

### داهێنانەکانی معاویە:

معاویە هەندێك شتی داهێنا کە پێش ئەو نەبووە، لەوانە:

١/ مقصورەی ژوورۆچکەی نوێژی بۆخۆی دانا. لە ترسی کوشتن لە نوێژکردن.

٢/ پۆستەی ڕێکخست، و هێستری کلك براوەی بۆ دانا.

٣/ دیوانی مۆرکردنی دانا (دیوان الخاتم).

٤/ پەردەداری لە نێوان خۆی وخەڵك دانا.

٥/ خەلافەتی کردە پشتاو پشت.



## فراونبوونی دەوڵەتی ئومەوی

سەردەمی معاویە بە فراوانبوونی دەوڵەتی ئومەوی دادەنرێت، و لەو سەردەمەدا توانیان بگەنە دوورترین خاڵ. لە ڕۆژهەلاّت گەیشتنە ولاّتی (سند) و (بوخارا)، و هەر جێگایەکی دەستی بەسەرداگرتبێت توانیویەتی تا رادەیەکی باش، ئەمن و ئاسایشی تیادا بەرقەرار بکات، هێرشەکانی بە هاوینەو زستانە بەردەوام بووە، لە وشکانی و ئاو دا و گرنگترین هەوڵەکانی بۆگرتنی قسطنطنية بوو کەگەمارۆی داوە، بەلاّم پێی نەگیراوە.

## یەزیدی کوڕی معاویە ( ٦١ – ٦٥ك ):

پاش مردنی معاویە یەزیدی کوڕی هاتە جێگای (بە پێی سیستەمی پشتاو پشت) چوار ساڵ حوکمرانی کرد، لەو سەردەمەدا چەند کارێکی دڵتەزێن ڕوویدا بووە مایەی نارەزایی موسڵمانانو تێکچوون و پارچە پارچە بوونی موسڵمانەکان، و خەلیفەکانی دوای یزیدیش نەیانتوانی چارەسەری بارودۆخەکە بکەن تا هاتنی خەلیفە عەبدولمەلیك کە توانی هێزو سەروەری بۆ ئومەوییەکان بگێرێتەوە.

## گرنگترین ڕووداوەکان:

١- شەهیدکردنی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلی لە ١٠ی محرم ساڵی ٦١ کۆچی، ئەم ڕووداوە لەکەیەکی ڕەشە لە مێژووی ئومەوییەکان.

٢- ڕووداوی حەرە: لە ساڵی ٦٣ی کۆچی: ئومەوییەکان پەلاماری مەدینەو دواتر مەککەیان دا زیانیان بە کەعبە گەیاندو ئازاری خەڵکی مەککەیان دا.

## عەبدولمەلیك مەروان (٦٥ك – ٨٦ك)

عەبدولمەلیك کوڕی مەروان کوڕی حەکەم، لە ساڵی ٢٦ی کۆچی لە مەدینە لەدایك بووە، هەر لە گەنجییەوە بایەخی داوەتە خوێندن و فێربوون، لە مەدینە بە پیاوێکی دیندارو تێ گەیشتو ناسرابوو، لەدوای باوکی بووە خەلیفە، لە سەرەتای هاتنی وڵاتی موسڵمانان بەش بەش و شڵەژاو بوو، بە هێزو دەسەڵاتی سەربازی و دوای ڕوودانی چەندین شەڕ لە دژی (عبداللەی کوڕی زوبێر) توانی بەسەریدا زاڵ بێت و دەسەڵات بکێشێتەوە بۆ سەر هەموو دەوڵەتی ئیسلام، و لەم شەڕەشدا دووبارە هەردوو شاری پیرۆزی (مەککە و مەدینە) بەر پەلاماری ئومەوییەکان کەوتن.

### شۆڕشی عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەث:

لە ساڵی ٨٠ی کۆچی عەبدولرەحمان کوڕی ئەشعەث، کرا بە والی هەرێمی سەجستان لە سنووری هند، (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) کەوالی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی بوو لە عێراق دادەنیشت. شەڕی تورکەکانی پێ سپێردرابوو کە یاخی بوون و سەرانەیان نەدەداو دەست درێژیشیان کردبووە سەر موسڵمانان. کوڕی ئەشعەث بە سەرکەوتووی کاری خۆی ئەنجامداو تەمبێی کردن و توانی وڵاتەکەشیان بگرێت وا دیارە لەشکرەکەی ماندوو ببو، بۆیە ویستی لە وەرزی زستاندا هەندێك پشوویان بداتێ، ئینجا لە هاویندا جارێکی تر هێرش بکاتەوە سەریان، کە حەجاج بەمەی زانی زۆر پەست بوو ماوەیەك پێوەبوو ڕازی بکات بەردەوام بێت لە شەڕکردن ، بەڵام سەری نەگرت، ئەوە بووە هۆی تێکچوونی نێوانیان کە ئەوەش بووە هۆی فراوان بوونی بزووتنەوەکەی الاشعث و ژمارەیەکی زۆر لە مەوالی (واتا موسوڵمانی نا عەرەب) بەتایبەتی کورد و فارس هاتنە پاڵ بزووتنەوەکە بەهۆی

بێزاربوونیان لە سیاسەتی الحجاج، ئەوەبوو الاشعث نزیك بۆوە لە گرتنی عیراق.

لە ساڵی ٨٢ی کۆچی لە (دیر الجماجم) لە نزیك کوفە، ئومەوییەکان سەرکەوتنێکی یەکلا کەرەوە بەدەست دێنن، عەبدولرەحمان بۆ وڵاتی تورکەکان هەڵدێت و بە دەسیسەی ئومەوییەکان لە ساڵی ٨٥ی کۆچی دەیکوژن.

## گرنگترین کارەکانی عەبدولمەلیك

١- بە عەرەبی کردنی دەزگاکانی دەوڵەت: بە واتای گۆڕینی هەموو شتێك لە دەوڵەتەکەیان بۆ زمانی عەرەبی چونکە پێشتر زمانی فارسی و یۆنانی بەکار دەهاتن و گرنگترین گۆڕانەکان ئەم بابەتانە دەگرێتەوە:

أ- بە عەرەبی کردنی دیوانەکان:

عەبدولمەلیك فەرمانی دا کە گشت دامو دەزگاکانی دەوڵەت بە واتای دیوانەکان بکات بە عەرەبی، زمانی ڕۆمی لە شام و فارسی لە عێراق گۆڕی بە عەرەبی، بەڵام لە وڵاتی میسر ئەم کارە دوا خرا تا سەردەمی کوڕەکەی وەلید ٨٦ – ٩٦ی کۆچی، ئاکامی ئەم کارە، فەرمانبەرانی دیوانەکان ناچاربوون خۆیان فێری زمانی عەرەبی بکەن بۆ ئەوەی لەسەر کارەکانیان بمێننەوە زمانی عەرەبی بووە زمانێکی فەرمی (ڕەسمی)، ئەوەش هەنگاوێك بوو بۆ ئەوەی خەڵك لە هەموو وڵاتانی ئیسلام فێری زمانی عەرەبی ببن.

ب- خەلیفە عەبدولمەلیك لە ساڵانی ٧٤ و ٧٥ی کۆچی فەرمانی دا کە گشت پارەکان و دەوڵەتی ئیسلامی بە نەخش و نیگاری عەرەبی ئیسلامی بنەخشێنێ پارەکانی پێشتری ڕەت کردەوە و هەر کاربەدەستێك (عامل)

له وڵاتی خۆی دا  بۆی هەبوو پارە لێ بدات بەو شێوەی کە دەوڵەت جۆی داناوە، کە پێی دەگوترا (پارەی ئیسلامی) و جێگای دەرکردنی پێی دەگوترا (دار السكة) واتە (خانەی دراو لێدان).

**پرۆژەکانی ئاوەدان کردنەوە:**

١- دروستکردنی مزگەوتی ئەقصای شەریف و قوبەی سەخرەی موشەرەف له قودس. له ساڵی ٦٦ی کۆچی دەست کرایە دروستکردنی هەردوو مزگەوت، و زەوییانەی حەوت ساڵی تەرخان کرد بۆ دروست کردنیان، و له ساڵی ٧٢ی کۆچی کۆتایی بە دروستکردنیان هات.

٢- ڕێکخستنەکانی ئیدارەی دەوڵەت:

ئەو کارانەی کە معاویە دەستی پێکردبوون عەبدولمەلیك تەواوی کردن وەك ڕێکخستنی دیوانی، زەویانە بوو، پاش ئارام بوونەوەی بارودۆخی دەوڵەت دەستیان کرد بە سەرژمێرکردنی (اهل الذمة) جولەکەو مەسیحی، بۆ دانانی سەرانە له سەریان.



## وەلیدی کوڕی عبدالملك ( ٨٦– ٩٦ك )

وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك، جێگری باوکی بوو، پاش مردنی بوو بە خەلیفە و، ماوەی ١٠ساڵ لە دەسەڵات مایەوە، سەردەمەکەی ئارامی و خۆشی و هەرزانی بەخۆوە بینی، وەلید توانی زۆر جێگا بگرێت و بیخاتە ژێر فەرمانڕەوایی خۆی بەتایبەتی بلاد السند و بلاد ماوراء النهر (لە ڕۆژهەلآت) و، ولآتانی خۆرئاوای عەرەبی و ئەندەلوسی (لە ڕۆژئاوا). ڕەخساندنی ئەو بارودۆخە دەگەڕێتەوە بۆ هێزو توانای باوکی چونکە پاش مردنی دەوڵەتێکی فراوانو ئارامی بۆ بەجێ هێشت.



## عومەر کوڕی عەبد ولعەزیز ( ٩٩ – ١٠١ کۆچی )

عومەر کوڕی عەبدولعەزیز کوڕی مەروان کوڕی حەکەم، لە ساڵی ٦٢ی کۆچی لە دایکبووە، لەگەڵ باوکی بووە کاتێ لە میسر والی بوو و لەسەر داواکاری خۆی باوکی ناردی بۆ مەدینە بۆ خوێندن و دانیشتن لەگەڵ زاناو پیاوە ئاینیەکان، هەر لە بچوکییەوە قورئانی لەبەر کرد، شارەزاییەکی زۆری لە زانستە جیاجیاکان هەبوو، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خاوەن ڕەوشتێکی

بەرزو دەست پاك، زمان پاراو بوو دوور بو لە لوت بەرزی و بە فیز نەبوو ، وەك عومەری كوڕی خەتتاب بۆیە بە خەلیفەی ڕاشدی پێنجەم ناسراوە.

### گرنگترین كارەكانی عمری كوڕی عەبدولعەزیز:

١- سەرانەی لەسەر ئەو كەسانە نەهێشت كە ببوونە موسڵمان لە (اهل الذمة) جولەكەو مەسیحی و زەردەشتی، كە پێشتر ئومەویەكان بە ناڕەوا لێیان دەستاندن.

٢- یەكەم كەس بووە تەماشای سكاڵای غەدر لێكراوەكانی كردووە و فەرمانی داوە گشت كاربەدەستان وەك ئەو بكەن.

٣- فەرمانی بە كاربەدەستان كردووە بەپێی قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) كار بكەن.

٤- لە سیاسەتیدا پەیڕەوی ئاشتی كردووە، لەگەڵ خەوارجەكان گفتوگۆو دانیشتنی كردووە، ژمارەیەك هاتنە ڕیزی ئەو و ژمارەیەكیان چالاكیان لە سەردەمی حوكمی ئەودا ڕاگرت.

٥- زەوی و زاری چاك كردووە، بیری لێداو ڕێگاو بانەكانی چاككردەوە.

لە ساڵی ١٠١ ك خەلیفە عومەر كوڕی عەبدولعەزیز كۆچی دوایی كردووە.

### خەلیفە مەروان كوڕی محمد (١٢٧ - ١٣٢):

مەروانی كوڕی محەمەد، لە جزیرە باكوری كوردستان لەدایك بووەو پەروەردە كراوە، هەر خۆشی بە والی كوردستان و ئەرمینیا دانرا، مەروان لە دژی خەلیفە ئیبراهیم كوڕی وەلید ڕاوەستا، وە توانی هێرش بێنێتە سەر شام لەشكری خەلیفە تێك بشكێنێت وە بە سەركەوتوویی

ڕاگەیاندنی دەوڵەتی دا ، بەلاّم لە ساڵی ١٣٢كۆچی دەوڵەتی ئومەوی هەرەسی هێنا.

**ڕاهێنان**

یەكەمین خەلیفەی ئومەوییەكان خەلیفە [ ] بوو

دوامین خەلیفە: [ ] بوو

دە تۆش ساڵی دامەزراندنی ............... و ساڵی لەناوچوونی ئومەوییەكان ............ بنووسە.

## هۆیەكانی ڕووخانی دەوڵەتی ئەمەوی:

ڕووخانی دەولەتی ئەمەوی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆیانەی خوارەوە:

هەرچەندە بیرو بۆچوونی جیاواز هەنە بۆ ڕوونكردنەوەی ڕووخانی دەوڵەتی ئەمەوی ، بەلاّم ئەم هۆیانە زۆر زەقن.

١- زەفتكردنی دەسەلاّت، چونكە مافیان نەبوو بەزۆری دەستیان بەسەردا گرت.

٢- بەكارهێنانی توندو تیژی لەگەڵ خەڵك.

٣- خەڵكی خراپ و بێ سودیان لەخۆ نزیك كردبووەوە.

٤- ماڵ و سەروەتی خەڵكیان بە ناهەق دەخوارد.

٥- زۆر لە والی و كاربەدەستەكانیان دلّڕەق و ستەمكاربوون.

# بەندی پێنجەم
# سەردەمی دەوڵەتی عەباسی
# ( ١٣٢ - ٦٥٦ )ك

## بنەماڵەی عەباسییەکان:

پاش مردنی عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب، عەبدوللای کوڕی کە لە هەموویان بەناوبانگتر بوو لەگەڵ ئومەوییەکان بەئاشتی ژیا، پاش مردنی عەباس عەلی کوڕی لە لایەن ئومەوییەکان ڕەوانەی شارۆچکەی (حمیمە) دەکرێت تا ساڵی ١١٨کۆچی لەوێ کۆچی دوایی دەکات، بەڵام عەلی کوڕی کە ناوی عەبدوللایە یەکەم کەس دەبێت لەم بنەماڵەیە ئارەزووی خەلافەتی دەبێت، کە ئومەوییەکان دەزانن، زۆر بەتوندی دژایەتی دەکەن و ئازاری دەدەن. پاش هەوڵ و کۆششێکی بێ وچان، عەباسییەکان توانیان نەیارو دوژمنانی ئومەوی لەژێر دروشمی (ڕازی بوون لە بنەماڵەی محەمەد (د.خ) (الرضامن آل محمد (ص) یەك بخەن و دەوڵەتێك دامەزرێنن بەناوی (عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب) کە مامی پێغەمبەرەو لە ڕووی تەمەنەوە گەورەی بنەماڵەکە بوو.

## ئامانجی عەباسییەکان:

بانگێشتی عەباسی بزووتنەوەیەکی سیاسی بوو، مەبەستی سەرەکیان:

١- نەهێشتنی ئومەوییەکان

٢- نەهێشتنی جیاوازی لە نێوان عەرەب و موالییەکان – موسڵمانی غەیرە عەرەب.

٣- پەیڕەو کردنی فەرمایشتەکانی قورئان و کردەوەکانی پێغەمبەر (د.خ).

## دامەزراندنی دەوڵەتی عەباسی:

گەلانی ئێران توخمی سەرەکی بوون لە دامەزراندنی ئەم دەوڵەتە، زۆربەی ئەو توێژانەی کە بە تەنگ ئەو بانگێشتەوە هاتن چینی هەژارو چەوساوە بوون، کە ئامادە بوون بۆ هەر کارێك ببێتە هۆی بەدی هێنانی ئاواتەکانیان.

## بانگێشتی عەباسی ( قۆناغی نهێنی ):

عەباسییەکان بە مەبەستی بڵاوکردنەوەی بانگێشتەکەیان، لە گشت ولاتانی ئیسلام بانگەوازیان کرد، بەتایبەت جێگا دوورەکان لە رۆژهەڵاتەوە بە شێوازی جیا جیا، هەبووبە ناوی بازرگانی، بەناوی سۆفیایەتی ....... هتد. تاکو ئاشکرا نەبن و زەمینە خۆش بکەن و لەسەر پێ ڕابوەستن ئینجا ئاشکرای بکەن.

## ڕێکخەری بانگێشت:

ئەم کارە سیاسیە لە لایەن (ئیبراهیمی ئیمام) کە ئیمامی گەورەیان بوو، جێبەجێ دەکرا، لە سەرەتا بە پێی فەرمانەکانی ئیمام، بەهیچ شێوەیەك ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئومەوییەکان قەدەغە بوو، لەترسی ئاشکرابوون، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو ناوەڕۆکی بانگێشتەکە دیار نەبوو.

## قۆناغی ئاشکرا:

زۆر بە ڕێك و پێکی، بانگێشتەکان ڕەگ و ڕیشەیان لەناو خەڵك داکوتا و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك وە گەڵیان کەوتن، ڕۆژ لە ڕۆژ لە پەرەسەندن دابوون، ئینجا وای لێهات کە ئاشکرای بکەن، بەڵام بۆ دەست نیشانکردنی جێگایەك بۆ کارکردن پاش ڕا گۆڕینەوەو گفتوگۆ کردن دەست نیشانی شاری (مەرۆ) کرا بۆ ئەم مەبەستە، و لە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ١٢٩ ی کۆچی / ٧٤٦ زایینی، بانگێشتەکە ڕاگەیێنرا.

## ئەبو موسلمی خۆراسانی:

لە قۆناغی نهێنیدا، لاوێکی کوردی خوێن گەرم و ئازا، پەیوەندی بە (ئیبراهیمی ئیمام) کرد بۆ کار کردن، پاش ماوەیەك دیتیان ئەم لاوە خاوەن توانایەکی زۆرە، کردیان بە سەرپەرشتیاری بانگێشتەکەیان لە خۆراسان، ئیمامی گەورە ئەوەندە بڕوای پێ هەبووتا ڕاددەیەك نهێنییەکانی بۆ ئاشکرا کردبوو، ئازایەتی ئەبو موسلم و ناوبانگی، ئومەوییەکانی تۆقاندبوو، لە هەرێمی خۆراسان عەرەبەکانی لێك جیا کردبووەوە، پاش ماوەیەك توانی دەست بەسەر خۆراسان دا بگرێت و کارمەندی ئومەوییەکان دەربکات، و خۆی ئیدارەی ئەم هەرێمەی گرتە دەست.

## شەڕی زاب لە ساڵی ١٣٢ی کۆچی:

دوای ماوەیەك ئومەیەکان ئیبراهیم ئیمام دەستگیر دەکەن و لە بەندینخانە دەیکوژن، پێش مردنیشی ڕابەرایەتی (خەلافەتی) سپاردبوو بە أبـو العباسـی بـرای کـە ئـەمیش سـاڵی ١٣٢ خەلافـەتی عەباسـی لـە کوفـە ڕادەگەیەنێت و خەڵکی کوفەش بەیعەتی دەدەنێ، خەلیفە مەڕوان بەخۆی و لەشکرێکی زۆرەوە لە جەزیرە هاتە مووسل ئەبولعەباس بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی مەڕوان لەشکرێکی پێکهێنا بە سەرۆکایەتی مامی (عەبدوللای کوڕی عەلی) هەردووکیان لەسەر زێی گەورە نزیك شارۆچکەی خازر گەیشتنە یەك، شەڕ و پێکدادان دەستی پێکرد لە ئەنجام دا ئومەوییەکان شکستیان هێنا، هەرچەندە ژمارەی شەڕکەرەکانیان دەگەیشتە دەیان هەزار کەس،ناچار بون پاشەکشە بکەن بۆ شاری موسڵ، بەلأم خەڵکی موسڵ نەیانهێشت بچنە ناو شارو دەرگەیان لێ نەکردنەوە، ناچار بوون بەرەو ولأتی شام بچن. عەباسییەکان ڕاویان نان، مەڕوان لە هیچ جێگایەك خۆی نەگرتەوە تا گەیشتە ولأتی میسر، پاشان توانی خۆی بگەیێنێتە گوندی (بوصیر) عەباسییەکان وازیان لێ نەهێنا تاکو لە گوندەکە کوشتیان.

بە کوشتنی (مەڕوان کوڕی محەمەد) دەوڵەتی ئەمەوی کۆتایی هات.

## سەردەمی یەکەمی عەبباسی ( ١٣٢ – ٢٤٧کۆچی / ٧٥٠ – ٨٦١زاییینی ):

ئەم چاخە لە دەست بەکاربوونی خەلیفە ئەبولعەباس سفاح دەست پێدەکات تا کوشتنی خەلیفە ئەلموتەوەکل لە ساڵی ٢٤٧ی کۆچی لەم ماوەیەدا عەباسییەکان گشت هەوڵ و کۆششیان بۆ چەسپاندنی دەسەڵاتیان بووە.

دەوڵەتی عەباسی لەسەر بنەمایەکی ئاینی دامەزراو، کاریگەرترین چەك کە بەکارهێنرا بۆ رووخانی دەوڵەتی ئومەوی تا گەڕانەوەی دەسەلات بۆ بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ): بەم جۆرە ئەم دروشمە خەڵکانێکی یەکجار زۆری لێ کۆکردبووەوە. بە تایبەت خەڵکی هەژارو سادە، عەباسییەکان زۆر زیرەکانە دەستنیشانی مەڵبەندەکانیان کردبوو، بە تایبەت کوفەو خۆراسان کە خەڵك لایەنگیریان دەبێت، زۆربەی هەرە زۆری ساسانییەکان بوون، چونکە بنەماڵەی پێغەمبەریان خۆش دەویست.ساسانیەکان خاوەن مێژوو کەلتورێکی رەسەنن، کە دەسەلاتیان بەسەر عەرەبەکان داگرتبوو لە عێراق و یەمەن، بەلام بە هاتنی ئاینی ئیسلام دەسەلاتیان نەما، ئەم بانگێشتەیان بە هەل زانی بۆ ئەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە، بۆ بەدی هێنانی ئامانجەکانیان. ئینجا هەر لەم قۆناغەدا، عەباسییەکان ئەوەی گومانیان لێ کردبا، لەناویان دەبرد و بە پێی رێنماییەکانیان کە بە ئەبو موسلمی خۆراسانیان راسپاردبوو رێیان پێ دابوو هەرکەسێ گومانی لێ بکات بیکوژێ، و زۆر کەسیشی کوشت، و هەربەخۆشی دەبێتە قوربانی گومان لێکردن و دەکوژرێت.

پاش مردنی (ئەبولعەباس) لە ساڵی ١٣٦کۆچی، خەلیفە ئەبو جەعفەر ئەلمەنسور جێگەی گرتەوە، ئەلمەنسور بەردەوام لە کوششدا بوو بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی دەوڵەتی عەباسی زیاتر بە بنیاتنانی شاری (بەغدا) ناوبانگی دەرکردبوو.

## سەردەمی دووەمی عەباسی
## چاخی دەسەلاتی تورکی ( ٢٤٧ – ٣٣٤ ) کۆچی

ئەم سەردەمە بە دەست بەکاربوونی خەلیفە مونتەسر دەست پێدەکات لە ساڵی ٢٤٧کۆچی / ٨٦١ زایینی لەم سەردەمەدا دەست تێوەردانی تورکەکان بۆ کاروباری دەوڵەت دانان و لادانی خەلیفەکان دەستی پێکرد بۆ ئەو مەبەستە تورکەکان کوشتن وچاودەرهێنان خەلیفەکانیان پیادە دەکرد.

جاری وا هەبوو خەلیفەیان ناچار کردووە تا بە دەستی خۆی لادان بنوسێت چ بۆخۆی چ بۆ یەکێکی تر، جگە لەم حاڵەتە، تورکەکان لە نێو خۆشیان ناکۆکیان هەبوو ئەم کارە تەنایی و ئاسایشی ولأتی شێواندبوو.

مونتەسر لە شەش مانگ زیاتر نەیتوانی خەلافەت بکات، لە بارودۆخێکی نادیاردا مرد، سەرکردە تورکەکان دەستیان لە مردنی هەبووە.

تورکەکان خاوەن دەسەلأتی ڕاستەقینەبوون، وا ڕێك کەوتن کوڕەکانی (موتەوەکیل) نەکەن بە خەلیفە، بەڵکو هەوڵیاندا خەلافەت لە کوڕەکانی موعتەسەم دەرنەچێت.

پاش هاتنی موستەعین (٢٤٨ – ٢٥٢ی کۆچی) بارودۆخ جێگیر نەبوو، بۆیە بێزار بوو سامەڕای بەجێهێشت، چوو بۆ بەغدا ژمارەیەك تورك و کاربەدەستی لەگەڵ بووە بەلأم خەلیفە هیچی بەدەست نەبوو.

تورکەکان کە دیتیان خەلیفە سامەڕای جێهێشتووە، هەستیان کرد کە جێگایان لەق بووە هەوڵیاندا ڕازی بکەن و بگەڕێتەوە بەلأم نەگەڕاوە، تورکەکان موعیزی کوڕەمامیان لە جێگای دانا، بەم جۆرە موستەعین لە بەغداو موعیز لە سامەڕا لە ئاکامدا شەڕ لە نێوانیان بەرپا بوو هەردوو شار گەمارۆ دران لەبەر ئەوەی ژمارەی دانیشتوانی بەغدا زۆربوون بەرگەی گەمارۆدانیان نەبوو، بە باشیان زانی کێشەکە چارەسەر بکەن وە موستەعین ناچارکرا بەغدا بەجێ بهێڵێت و بچێتە شاری مەککەی پیرۆز.

## سەردەمی سێیەمی عەباسی

## چاخی دەسەلاتی بوەیهییەکان ( ٣٣٤ – ٤٤٧ کۆچی/ ٩٤٥ - ١٠٥٥زایینی )

بوەیهییـەکان خـەڵکی دەیلـەم بـوون – ولاتێکـە دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژئاوای دەریای قـەزوین – لـە سـەرەتای بـڵاو بوونـەوەی ئـایینی ئیسـلام، بوەیهییەکان بەهۆی چیایی ولاتیان نەبوون بە موسڵمان تا دواتـر ئیسـلام لـە نێویان بڵاوبۆوە.

عەباسییەکان توانیان ئەم هەرێمە بە ولاتی ئیسلامەوە بلکێنن، بە تایبەت لـە سـەردەمی ئـەبو جەعفـەری مەنسـوور (١٣٦ – ١٥٨ کۆچـی) لـە سـەردەمی هارونە ڕەشید (١٧٠ – ١٩٣کۆچی) ئەم ولاتە بـووە مۆڵگـەی یـەحیای کـوڕی عەبدوڵلای عەلەوی، توانی خـەڵکێکی زۆر لـەخۆی کـۆ بکاتـەوە مەترسـی بـۆ ڕەشید پەیدا کـردوو، ترسـا نـەوەك جیـا ببێتـەوە، ئینجـا پێـك هـاتن لەگـەڵ یەحیا بمێنێتەوە بەلام لەژێر ئالای عەباسییەکان.

بڵاو بوونەوەی ئایینی ئیسلام بە فراوانی لەم هەرێمە دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (٢٥٠ کۆچی– ٨٦٤ زایینی) حەسەن کوڕی عەلی چووە ولاتی دەیلەم، سێزدە ساڵ مایەوە توانی بیرو باوەڕی تا ڕاددەیەك بڵاوبکاتـەوە پـاش مردنـی بـاری ولات تێك چوو ناکۆکی و ململانێ لە نێو سەرکردەکان بووە هۆی پەیدا بوونی بوەیهییەکان.

## سەرەتای پەیوەندی بوەیهی و عەباسی:

لە سەردەمی خەلیفە ئەلرازی بیللا (٣٢٢ — ٣٢٩ کۆچی) سەرکردەی بوەیهی (عەلی کوڕی بوەییە) پەیوەندی لەگەڵ عەباسییەکان کردبوو، بۆ ئەوەی دان بە پەیوەندییەکان دا بنێن، بەرامبەر بە پارەیەکی زۆر لەبەر نەبوونی و هەژاری عەباسییەکان ڕازی بوون، پاش ماوەیەك بوەیهییەکان لە پارەدان پاشگەزبوونەوە، بەڵام ئامانجی خۆیان بەدی هێنا و شەرعیەتیان وەرگرت، بوەیهییەکان زیرەکانە کاری خۆیان جێبەجێکرد.

بوەیهییەکان ئاگاداربوون کە سیاسەتی خەلیفە ئەلرازی (٣٢٢ — ٣٢٩ کۆچی) بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە چی بۆ نەکرا. بوەیهییەکان خۆیان خۆش کرد و چاویان بڕیبووە عێراق داگیری بکەن، بۆ ئەوەی هێزی دەوڵەتی عەباسی تاقی بکەنەوە چەند جارێك هێرشیان هێنا سەر چەند ناوچەیەك، بەڵام عەباسییەکان نەیانهێشت.

## گرتنی بەغدا:

لە سەردەمی خەلیفە ئەلموتیع (٣٣٤ — ٣٦٣ کۆچی) بوەیهییەکان بە سەرۆکایەتی (ئەحمەد کوڕی بویە) ناسراوە بە (معز الدولة) هاتنە ناو بەغدا، وەك هەر داگیرکەرێك بوەیهییەکان بە پلەی یەکەم بەرژەوەندی خۆیان ڕەچاو دەکرد، بۆ هەڵسوڕاندنی کارو باری عێراق زۆربەی وەزیرو کاربەدەستەکانیان فارس بوون، خەڵکی بەغدا بێزاری و ناڕەزاییان دەربڕی.

## سەردەمی چوارەمی عەباسی

## چاخی دەسەلاتی سەلجوقی ( ٤٤٧ – ٥٩٠ك )

سەلجوقییەکان کۆمەڵە هۆزێکی تورکن، لە دەشتەکانی تورکستان هاتوون، و ناوەکەشیان لە سەرکردەی بەناوبانگیان سەلجوقی کوڕی دقاق هاتووە.

سەلجوقییەکان نەیانتوانی لە ولاتی خۆیان بسرەون، ڕوویان کردە ولاتی موسڵمانان لە ڕۆژ ئاوا، لە ساڵی ٣٤٥ کۆچی / ٩٥٦ زایینی دەسەلاتیان دەستی پێکرد.

پاش بەسەرهاتێکی دوورو درێژ، سەلجوقییەکان جێ بەجێ قۆناغ بە قۆناغ تا گەیشتنە نزیك عێراق لە ساڵی ٤٤٧ کۆچی / ١٠٥٥ زایینی ، توغرول بەگی سەرۆکیان نامەیەك بۆ خیلافەتی عەباسی دەنوسێت، ئەو پەڕی لایەنگری و ملکەچی پیشان دەدات و پەیمان بە بوەیهییەکان دەدات کە پێویستە هاوکاری یەك بن، ئەم دبلۆماسییەتە بوەیهییەکان و عەباسییەکانی کردە دۆستی خۆیان، لە کاتێکدا عێراقیەکان بە دەستی بوەیهییەکان دەیانناڵاند سەرەڕای کێشەی نێوان خۆیان، ئەمانە هەر هەمووی لە بەرژەوەندی سەلجوقییەکان دا بوو، و یەکەم هەنگاوی سەلجوقییەکان سوود وەرگرتنبوو لە بوەیهییەکان، بۆ زەمینە خۆشکردن و ڕێ خۆشکردن بۆ داگیر کردنی عێراق.

سەلجوقییەکان لە ئامادەباشی دا بوون بۆ داگیر کردنی بەغدا، سەرکردەیەکی تورك (بەساسیری) دەستی بەسەر کاروباری بەغدادا گرتبوو، وە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان خەلافەت و بوەیهی و بەساسیری دا نەمابوو.

لە ساڵی ٤٤٧ کۆچی / ١٠٥٥ زایینی توغرول بەگ بەرەو عێراق کەوتە ڕێ، لە شاری حەلوان هاتە ناو خاکی عێراق، کە کورتترین و ئاسانترین ڕێگەیە بۆ

هاتنە ناو بەغدا بۆ ئەوەی کە هاتنەکەی سروشتی بێت، لایەنگرانی بە رەنگاری نەبنەوە، نامەیەك بۆ (دیوانی خەلافەت) دەنێرێت، تیایدا دڵنیایی خەڵك دەکاتەوە تەنها هاتنی بۆ بەغدا، قۆناغێك دەبێت بۆ چوونە حەج، و نیازی وایە کە رێگای حەج ئاوەدان بکاتەوە چاکی بکاتەوە، ئینجا هەوڵ دەدا دەسەلاتی فاتمییەکان لەم ناوچە نەهێڵێت.

ئەم نامەیە خەڵکەکەی دڵنیا کردەوەو، ترسیان نەما، و خەلافەتی عەباس دەستخەرۆ کرا، خەلیفە ئەلقائم بیئەمریللا بڕیاری دا ناوی سوڵتانی سەلجوقی لە وتاری نوێژی هەینی بێنێت. و توغرول بەگ بە رەسمی مۆڵەتی وەرگرت کە بێتە بەغدا، و بە پێشوازی گەرم بەخێرهاتنی لێکرا، وە لە ٢٥ی مانگی رەمەزان ساڵی ٤٤٧ کۆچی/ ١٠٥٥ زایینی سەلجوقییەکان بە رێو رەسمێکی رێك و پێك هاتنە ناو بەغدا.

## دواین چاخی عەباسی

پاش مردنی سوڵتان سنجر خاوەن دەسەلاتی سەلجوقی لە ٥٥٢ کۆچی/١١٥٧ زایینی دواین سوڵتانە بەهێزەکانی سەلجوقی، بێ هێزو لاوازی کەوتە ناویان، بە تایبەتی لە ساڵی ٥٦٠ — ٥٧٠ کۆچی وایان لێهات سوڵتانی سەلجوقی بەهێزیان نەما.

### خەلیفە الناسر لدینللا

لەم سەردەمەدا خوارزمەکان لە عێراق نزیك بوونەوە، خەلیفە ناسر داوای یارمەتی لێکرد بۆ دانانی سنوورێك بۆ سەلجوقییەکان، لەکاتی بەشداری کردنی سەربازی خوارزمەکان تەنها بەخۆیان بوون بێ ئەوەی لەشکری خەلیفە هاوکاریان بکات.

## المستعصم بالله :

پاش موستەنسەر سالّی ٦٤٠ / ١٢٤٢ کوڕەکەی کە ناوی المستعصم باللە هاتە جێگای، پیاوێکی نەرم و لەسەر خۆ بووە بەلاّم لە حوکمرانی شارەزایی کەم بووە، لەبەر ئەوەی لاواز بوو، نەیتوانی بەرەنگاری ئەو کەسانە چاویان بڕیوەتە خەلافەت ببێتەوە، ئینجا هەرچەندە خەلیفە ئاگاداری مەغۆلەکان بوو کە چاویان بڕیبووە خەلافەت، بەلاّم ئەوەندەی بە هەند هەڵنەگرت، بەم جۆرە خەلافەت سەردەمی ئەم خەلیفەیە توشی داگیرکردنی مەغۆلەکان هات، وە بە دەستی مەغۆلەکان کوژرا، بەغدا لە سالّ ٦٥٦ کۆچی/ ١٢٥٨زایینی کەوتە دەستیان و بەتەواوی کۆتایی بە دەوڵەتی عەباسی هات.

### وەلاّمی ئەم پرسیارانە بدەرەوە

١- عەبدولمەلیك کوڕی مەڕوان بەچی بەناوبانگ بوو؟

٢- گرنگترین کارەکانی ئەبو جەعفەر مەنصور باس بکە.

٣- بوەیهییەکان لە کوێ هاتوون.

٤- چۆن بوەیهییەکان توانیان خۆیان بگەیێننە بەغدا؟

٥- سەلجوقییەکان لە سالّی ........ تا ......... حوکمرانی عێراقیان کرد.

## پرسیارەکان

ئەم بۆشاییانە پڕ بکەوە.

١- بەناوبانگترین خەلیفەی ئومەوی .............. بوو.

٢- دەوڵەتی ئەمەوی لە ساڵی ......... تا ساڵی .......... حوکمرانی کرد.

٣- لە ساڵی ............ حوسێنی کوڕی ئیمام عەلی کوژرا.

٤- لە سەردەمی عەبدولمەلیك کوڕی مەروان دیوانەکان کران بە زمانی .........

٥- ئەو پارەی کە عەبدولمەلیك دروستی کرد، پێی دەوترا پارەی ............

٦- مزگەوتی قبة الصخرة لە ............ دروست کرا.

٧- .............. سەرکردەی گرتنی قودس بوو.

٨- .............. یەکەم خەلیفەی ئەمەوی بوو تەماشای سکاڵای خەڵکی دەکرد.

٩- خەلیفە مەروان کوڕی محەمەد لە ............ لە دایکبووە.

١٠- دەوڵەتی عەباسی لە ساڵی .......... تا لە ساڵی ........... بەردەوام بوو.

# بەندی یەکەم

## - هاونیشتمانی بوون:-

یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی پرۆسەی دیموکراسی و بەختەوەری گەلان لە هەموو دونیادا گەشەکردنی دام و دەزگا و ڕێکخراوەکانی مەدەنییە، ئەم گەشەکردنەش بەهۆی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی خەسڵەتەکانی هاونیشتمانی بوون دەبێت ئەم چەند خاڵە وەکو ڕەوشتی تاك بێت بۆ بەهاونیشتمانی بوون وەکو:-

## ١- ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لە کارکردندا:

ڕاستگۆیی و دڵسۆزی ڕەوشتێکی تاکەکانە بۆ بە هاوولاتیبوون، واتا بوونی ئەم خەسڵەتانە لە توانای هاوولاتی بۆ کارابوون لە کۆمەڵگە بواری زیاتر دەرەخسێنێت.

## ٢- گیانی لێبوردەیی:

لەکاتی شەڕدا بیر لە ئاشتی دەکەینەوەو لەکاتی ئاشتیدا بیر لە داهێنان دەکەینەوە، هەموو کەسێك دەبێ گیانی لێبوردەی هەبێت تاوەکو بە ئاشتەوایی بژین، لەیەکتر گەیشتن‌و یەکتر قەبووڵ کردن فێری ئەوەمان دەکات چۆن بەرەو دیموکراسی بچین و بیروڕای پێچەوانە قەبووڵ بکەین و هیواو گفتوگۆ ببێتە زمانی هاوچەرخ.

## ٣- یەكگرتن و هاوكاری:

واته یەكگرتن لەسەر بنچینەی لەیەكتر گەیشتن و هیوای نیشتمانی و گیانی هاوكاریكردن لەگەڵ یەكتر.

### ڕاهێنان

**كەی من هەست بە بەرپرسیارییەتی دەكەم؟**

أ- كەی ئەركەكانی خۆم بەجێ هێنا ئەوە من هەست بە بەپرسیارییەتی دەكەم.

ب- ئەگەر مافەكانی بەرامبەرم پاراست ئەوە من هەست بە بەرپرسیارییەتی دەكەم.

جـ - ئەگەر ئەرك و مافی خۆم لێك جیا نەكردەوە.. ئایا هاونیشتمانی باشم؟

ئەگەر وەڵام : نەخێر بوو، بۆچی؟

بۆ؟

## ٤- هەست کردن بە بەرپرسیارییەتی:

هـەمووومان وەکـو تـاکێکی ئـەو کۆمەڵگایـە ئـەرکێکمان لەسـەر شـانە ئـەویش بەرپرسـیاریەتییە بەرامبـەر خـودی خۆمـانو پاراسـتنی دەسـکەوتە مرۆڤایەتییـەکان و بـەهێزکردنی پەیوەندییـە هەسـتییەکان لەگـەڵ ژینگـەو هەستکردن بـە بەرپرسـیاریەتییە بەرامبـەر کۆمـەڵگاو ڕێزگرتنـی بەرامبـەر و پاراستنی دامو دەزگای مەدەنیو نیشتمانییەکان.




## ٥- ڕێزگرتن لەیاسا:

کە کۆمەڵ هۆشیار بێت، دەیەوێت ڕێسایەك دابنێت بـۆ بەڕێوەچـوون و بەرنامەی کاری نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا، کاتێ یاسا دادەهێنێـت بـۆ ئـەوەی ببێت بە دروشمی سەرەکی کە هەمووومان لەبەردەم یاسا وەکو یـەکین، بۆیـە ڕێزگرتنی یاسا لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لەسەر هەمووومان پێویستە.

### ٦- ڕێزگرتن لە کات:

کات ئەو گەوهەرە بەنرخەیە کە پێویستە پارێزگاری لـێ بکـەین و ڕێـزی لێبگرین و بەهۆی بەفیڕۆنەدانی داهێنان دروست دەبێت و بەهۆی دڵسـۆزیش لە کارکردن کۆمەڵ بەرەو پێشەوە دەچێ.

### ٧- چەسپاندنی ئاشتیو پێکەوە ژیان:

واتــە قــەبووڵ کردنــی بــیروڕای جیــاواز و بــاوەڕکردن بــە یــەکترو ڕەزامەندبوون لە خود.

**چالاکی:** گرووپێك لە قوتابییان ڕاپۆرتێك لە بارەی بەهای کات ئامادەدەکەن.

### ٨- پاراستنی تایبەتمەندی:

هەمووما‌ن جۆرێك لە تایبەتمەندیمان هەیە کە بەشێکە لە کەسایەتی تاك، بەڵام کەسایەتی سـەرکەوتوو ئـەو کەسـەیە کـە تایبەتمەنـدی کەسـانی دیکـە دەپارێزێـت، ئەمـەش ڕێزگرتنـە لـە یـەکترو قـەبووڵکردنی شـتە نهێنییـەکانی یەکترە.

هاونیشتمانی بوون واتە گۆڕانی ڕەوشتو هەستکردن بە هەسـتی بەرامبـەر و پاراسـتنی و بـەهێز کردنـی دامو دەزگـای مـەدەنیو پێشخسـتنی پرۆسـەی دیموکراسی و مەدەنی لەڕێگای هۆشیار بوونەوە.

## ڕاهێنان

یەکسانی: دەبێت هەمووما‌ن بەرامبەر یاسا یەکسان بین

واتا یاسا فەرقو جیاوازی لە نێوان دەوڵەمەندو هەژار ناکات..

فەرقو جیاوازی لەنێوان بەرپرسێك و هاووڵاتییەکی ئاسایی ناکات..

بەڵام: ئایا یاسا فەرقو جیاوازی لەنێوان مرۆڤی (بێ گوناه) و مرۆڤی (تاوانبار) دەکات؟

بۆچی؟

بـەنـدی دووەم

# کۆمەڵگەو سروشتی پێکهاتەکەی

## أ- کۆمەڵگە چیە؟

مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە ناتوانێت بەتەنها بژیت، پێویستی بە کەسانی ترە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی سۆزو خۆشەویستی لەگەڵ کەسانی ترو هاوکاریکردنو یارمەتیدانی یەکترو پێکەوە ژیان، رەمەکی پێکەوە ژیان لە تاکدا پێی دەوترێت پێکەوە ژیانی کۆمەڵایەتی. واتە پێکەوە ژیانی بەکۆمەڵ ئەمەش رەمەکیەکە لە مرۆڤ وەکو ڕەوشتی لێهاتووەو بچووکترین رەمەکی بە کۆمەڵایەتی بوون لە مرۆڤ و ئاژەڵدا مەیلو حەزی دروستکردنی خێزانە، واتە گردبوونەوە لە چوارچێوەیەك کە سۆزو خۆشەویستیو ڕێزو هاوکاری کۆیان دەکاتەوە کە ڕەوشتەکان هاوبەشن لە نێوانیان، ئەمەش پێی دەوترێت خێزان، خێزانیش بچووکترین یەکەی کۆمەڵگایە، کۆمەڵگاش لەچەند خێزانێکی هەمەجۆر پێکدێت کە چەند فاکتەرێکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەیە وەکو (خاك، زمان، مێژوو، دابو نەریت، ڕەوشتو خەسڵەتەکانی لەیەکچوو، پەروەردەو کەوابوو خێزان یەکەم ژینگەی کۆمەڵایەتییە کە دەوری مرۆڤی داوەو تیایدا هەڵسوکەوت دەکات ئەوە ڕێگا ئاسان دەکات بەو هۆیەوە پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان ئەندامانیدا دروست دەبێت.

بەواتا کۆمەڵگە بریتییە لە (( **گردبوونەوەی دانیشتووانە**)) کە بڕوایان بەیەك هیواو ئامانجی پیرۆز هەیە، قازانجی هاوبەشو پەیوەندی ڕێكوپێك کۆی کردوونەتەوە لە ژیاندا، هەروەها یەکێك لە نیشانەکانی کۆمەڵگە ئەوەیە کە هەمیشە لە گۆڕان دایە.

**چالاکی:**

کۆمەڵگە (( گردبوونەوە دانیشتوانە)) بەڵام دەبێت:

باوەڕ بە ............... هەبێت.

# بنەماکانی کۆمەڵگە

## ١- ناوچە یان زەوی:

زەوی ئەو ڕووبەرە خاکەیە کە پێکهاتەکانی سروشت لەخۆدەگرێتو هۆکارەکانی ژیان بۆ مرۆڤ دەستەبەر دەکات و چەند کەسانێك لە شێوەی خێزانو گرووپی بچووك کە بەرژەوەندییەکان بەیەکەوە کۆیان دەکاتەوە لەسەر ئەم خاکە دەژیت بۆ بەردەوام بوونی ژیان بەکاری دەهێنینو سوودی لێوەدەگرن. بە درێژایی مێژوو ئەم ئاڵوگۆڕە بەردەوام دەبێت لە نێوان تاكو بەکارهێنراوەکانی زەوی بۆیە پارێزگاری لەم خاکە دەکاتو قوربانی بۆ دەدات، چونکە پەیوەندییێکی ڕووحی لە نێوان مرۆڤو زەویدا هەیە.

## ٢- شارستانییەتی:

یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی هەموو کۆمەڵێك ئەوەیە کە شارستانییەتی تایبەتی خۆی هەبێت و شارستانییەت لە ئەنجامی ململانێی نێوان مرۆڤەکان پێش دەکەوێت، کە ئەو کۆمەڵگایە لە ئەنجامی داهێنانو دروستکردن مێژووێك بۆ خۆیان تۆمار دەکەن کە بەردەوام شانازی پێوە دەکەنو دەبێتە دەستکەوتێکی نەتەوایەتی کە پێی دەوترێت شارستانییەت.

### ٣- سوودی هاوبەش:

هـەموو ئەوانـەی لـە کۆمـەڵگا دەژیـن ئـاڵوگۆڕی سـۆزو هاوکـاری و یارمەتیدانو بەرژەوەندی بەیەکەوە گرێیان دەدات کە ناتوانن بەتـەنها بـژین، بۆیە سوودی هاوبەش گەورەترین بنەمای کۆمەڵگایە.

### ٤- پەیوەندی کۆمەڵایەتی:

کۆمەڵناسان، پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی بـە بنچینـەی سـەرەکی کۆمـەڵگا دادەنـێن یـا کۆمەڵگـە پوختــەی ئـەو پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەی کۆمـەڵو تاکـەکانی کۆمـەڵ بەیەکـەوە دەبەسـتێت، بۆیـە هەمیشـە هـەوڵ دەدەن بـۆ دانـانی سیسـتـەمێك کـە ئاراسـتـەکردنو ڕەفتـار هەڵسـوکەوتیان بەرامبـەر کەسانی دیکە ڕێك بخات، ئەرکی ئەم سیستـەمە ئەوەیـە کـە ڕێ بـە چالاکی بداتو لە هـەمان کاتیشـدا سنووری بـۆ دابنێـت، چـونکە ئـەو سیسـتـەمە لـە ڕێگـای پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکانـەوە ئەوانـە دەسـت نیشـان دەکـات کـە پێویستە بکرێنو ئەوانەیش کە نابێت بکرێن.

**چالاکی:** لە نموونەی پەیوەندی
کۆمەڵایەتی، پەیوەندی نێوان

| | | | |
|---|---|---|---|
| منداڵ<br>و<br>دایكو باوك | برا<br>و<br>.... | قوتابی<br>و<br>.... | هاوولاتی<br>و<br>.... |

### ٥- یارمەتی و هاوکاری:

ئەمە بنچینەی پێکەوە ژیانە بۆ بەردەوام بوون لەناو کۆمەڵگا کە هەموومان پێویستیمان بە یەکترە، کەسمان ناتوانین بەتەنها بژین بۆ پتەوکردنی فاکتەرەکانی بە کۆمەڵایەتی بوونی تاك دەبێ هەمووماں یارمەتی و هاوکاری یەکتر بکەین.



### ٦- گۆڕانی نوێخوازیی:

بنەمای شارستانیەتو دانەبڕان لە ڕەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکانی تری جیهانە، پێویستە دژی وەستانو کۆنەخوازی بوەستێت، ئەمیش بەهۆی پێشکەوتنی دامودەزگای مەدەنی لە کۆمەڵگادا دەنێت.

لە نموونەکانی ((دامودەزگای مەدەنی))

| | | |
|---|---|---|
| ڕێکخراوی قوتابییان | سەندیکای ........ | سەنتەری مافی ..... |

## چالاکی

لێبوردن

ئەگەر برادەرەکەت بەرامبەر بەتۆ

ڕەفتاری هەڵەی نواند، تۆ چی

دەکەی؟

(( لێی تووڕە دەبی، بەناخۆشی وەڵامی دەدەیتەوە

لێی دەبووری؟

# پەرەسەندنی کۆمەڵگە

مێژوونووسان لەو بڕوایەدان کە خێزان لەسەرەتای دروستبوونیدا بەو شێوەیە نەبووە کە هەیە، چونکە هۆکاری سەرەکی دامەزراندنی خێزان ئابووریو بەرژەوەندی پێکەوە ژیان بووە، تاك نەیتوانیوە بە تەنها لە ئەشکەوتەکان بژیت بۆ بەردەوام بوونو خۆپاراستن لە کارەساتو ئافاتی سروشتیو ئاژەڵە دڕندەکان، بە کۆمەڵی بچووك بچووك لە شێوەی خێزان ژیاوە و مرۆڤ پێویستی بە یەکێك بووە بۆ یارمەتیدانیو مسۆگەرکردنی خۆراكو پێداویستییەکانی ژیانی، هەر ئەم هۆیەش بووە بۆتە هۆی موڵکایەتی لە تاك پەیدا بووە لە شێوەی ژنهێنان، بەڵام لەسەر ئەو یاساو مەرجو نەریتانەی ئێستا نەبووە، ئافرەت پایەکی بەرزی هەبووە لە خێزاندا، چونکە پەروەردەی منداڵو هەڵسوڕانی هەموو کاروبارێکی ناوماڵ کەوتبووە سەرشانی، هەرچەندە پیاو مسۆگەرکردنی خۆراكو ژینگەی ئارامو پاراستنی ژنو منداڵ لە دڕندەو فەوتاندنی بە کارەساتی سروشتی لەسەر بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ژن لە کۆکردنەوەی خۆراك و دروستکردنی کەلوپەلی ناوماڵ و جلوبەرگی لەسەر شان بووە.

لە کۆمەڵگای سەرەتاییدا پیاو ئەوەندە پێویستی بە ژن هەبووە کە پاڵی پێوە ناوە لە ژنێك زیاتر بهێنێت، تا بۆ منداڵ زۆریو گوزەران کەڵکیان لێوەربگرێت. لە ئەنجامی ئاڵۆزبوونی ژیانو زۆر بوونی هەمە جۆریی پێداویستییەکان خێزانەکان ناچاربوون یەك بگرنو کۆمەڵگەی بچووکی ساکار پێك بهێنن، ئەم کۆمەڵگە بچووكو ساکارانە بەرەبەرە بەهۆی زۆربوونی کەسانی ناویانەوە، یان یەکگرتنی چەند کۆمەڵێکی بچووك لەگەڵ یەکتریدا کۆمەڵگایەکی پەرەسەندوو پێشکەوتووترو گەورەتریان پێکهێناوە بەهۆی زۆر

بوونی پێداویستییەکانی ژیانو زیادبوونی داخوازییەکانی تاك گوزەران ئاڵۆز بووە، ئەمەش گەشەسەندنێکی تر بووە کە کۆمەڵگای سەرەتایی لە ئەشکەوتەکان دەربچنو شوێنی کەنار دەریا و رووبار و زەوی و رووبەری فراوانی کشتوکاڵی هەڵبژێرن، کۆمەڵگا بەوەش تێر نەبووە، چونکە بەکارهێنانی کشتوکاڵ تەواوی پێداویستییەکانی جێبەجێ نەکردووە، بۆیە هەوڵی داوە ئامێر دابهێنێت بۆ زیادبوونی بەرووبومی کشتوکاڵو جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی گوزەرانی رۆژانەو بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانو دابەشکردنی موڵکایەتی بەرووبومی رۆژانە، بۆتە هۆی پەیدابوونی سیستەمی فەرمانڕەواییو ئاینو کاروباری ئابووریو پەروەردەو سیستەمی خێزانو کۆمەڵایەتیو یاسا... لە ئەنجامی ئەمانەدا هەر کۆمەڵێك بووە خاوەنی خاكو قەوارەی سەربەخۆو شارستانییەتێکی تایبەتی جیا لە کۆمەڵگاکانی تر، بەم شێوەیە جیهان بەسەر چەندین کۆمەڵگەی جیاجیادا دابەشبوو. کە ناوی نرا دەوڵەت. ئەو کۆمەڵگایانەی کە ئێستا هەن دوای ئەوەی بەزۆر قۆناغی پێشکەوتنو پەرەسندندا تێپەڕیوون گەیشتوونەتە ئەم قۆناغەی کە ئێستا لە بووندا هەیە.

**چالاکی**: ئافرەت نیوەی کۆمەڵگەیە:
لەسەردەمی ئێستادا ژنان مافی خۆیان هەیە لە بەشداریکردن لە هەموو چالاکییەکانی گەشەپێدانی کۆمەڵگە، لەوانەش چالاکی سیاسی.. لە پەرلەمانی ئێستای عێراق.. رێژەی ئافرەتان چەندە..؟
لە پەرلەمانی کوردستان رێژەیان چەندە؟

# قۆناغەکانی پەرەسەندنی کۆمەڵگە

## ١- قۆناغی ڕاو و شکار:

ئـەم قۆناغـە بەیەکـەم قۆنـاغی بەرهـەمهێنی تـاك دادەنرێـت و یەکـەم قۆناغی کاری سەربەستە کە هێـزی کـاری خـۆی بـۆ خـۆی دەگەڕێتـەوە. کـە نیشانەیەکی گرنگی ئەم قۆناغە بووە، هەروەها نیشانەیەکی تری ئەم قۆناغە ئەوە بووە کە مرۆڤـ لەیەك شوێندا نیشتەجێ نەدەبوو، چونکە گەڕان بەدوای ئاژەڵدا بەنیازی ڕاوکردنی وای لە مرۆڤـ کردبـوو کـە نـەتوانێت لـە شـوێنێکدا بمێنێتەوە، هەر لەو شوێنەدا کە سەرچـاوەی گـوزەرانی ژیـانی تـەواو دەبـوو دەی گواستەوە بۆ شوێنێکی تر.



## ٢- قۆناغی ئاژەڵ بەخێو کردن:

بەشێوەیەکی گشتی قەبارەی کۆمەڵگەی ئاژەڵ بەخێوکردن لە کۆمەڵگەی ڕاو گەورەتر بوون، هۆی ئەمەش ئەوە بووە کە مرۆڤ توانی هۆیەکانی گوزەرانی بدۆزێتەوەو دەستی بەسەر دابگرێت، ژیانی کۆمەڵان لەم قۆناغەدا دامەزراوتر بوو، چونکە پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵگەکاندا پەیدابووە. هەروەها نیشانەیەکی تری ئەم قۆناغە دروستبوونی ململانێ بوو لە نێوان کۆمەڵەکان لەسەر دەستگرتن بەسەر لەوەڕگای ئاژەڵداو نیشانەیەکی تری ئەم قۆناغە دروستکردنی خانوو بوو، بۆ ئەوەی جێگەی کۆچکردنی بەردەوام بگرێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا هەندێك کۆمەڵگە هەبوون لە نێوان لەوەڕگاکاندا فێری گەڕان بوو بوون دەستیان لێ هەڵنەدەگرت.

**پرسیار:** بۆچی کۆمەڵەی بەخێوکردنی ئاژەڵ لە کۆمەڵەی ڕاو و شکار گەورەتر بوو؟

## - قۆناغی کشتوکاڵ:

فێربوونی کشتوکاڵ بە گەورەترین گۆڕان دادەنرێت لە ژیانی مرۆڤدا، چونکە کشتوکاڵ وای لە مرۆڤ دەکرد کە نیشتەجێ بێتو نەتوانێت لە زەوییەکەی دوور بکەوێتەوە، سنوورێك دیاری بکات بۆ دەسەڵاتی هێزی کاری لەسەر زەوی و ناچاربوو خانوو دروست بکاتو شوێنەکەی قایم بکات و لە نزیك کانیاوو ڕووبارو دەریاچە نیشتەجێ بێ، هەر ئەمەش بوو وایکرد پەرستگاو بنکەی پاراستنو کۆکردنەوەو دانانی یاساو پۆلیسو چەکدار بۆ

پاراستنی. ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانو چەکەرەکردنی بنەمایەکانی دەوڵەت، چونکە کۆمەڵ گۆڕا بۆ گوندو شار و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو کۆمەڵانەی لەسەر بنەمای کشتوکاڵ دامەزرا بوون ئەو هێزو پتەوییەی نەما، چونکە دانیشتوان لەگوندو شارەکاندا دەژیان کە دوور بوون لەیەکەوە.

**چالاکی:** (کشتوکاڵ) وەرچەخانێکی گەورە بوو لە ژیانی ئادەمیزاد، لەم بارەوە گفتوگۆ ساز بکرێت.

### ٤- قۆناغی پیشەسازی:

دوایین قۆناغی پەرەسەندنی ژیانی مرۆڤە، ئەمیش دوای ئەو هەوڵە زۆرانەی کە مرۆڤ دای بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانی سروشتو بەکارهێنانیان بۆ خزمەتی خۆی. ئەو راستی و زانیارییانەی زاناکان بەکاریان هێنا بۆ پشکنینی سامانە سروشتییەکانو بەکارهێنانی بۆ خێرو خۆشی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی. سەرەتا مرۆڤ بە پیشەسازی سووک (مانا فکتۆریا) دەستی پێکرد ئینجا بە پێی زۆربوونی پێداویستییەکانو زیادبوونی بەرهەمهێنان پیشەسازی قورس لە زۆر شوێنی جیهاندا دامەزرا. بەرادەیەك کە هەندێك کۆمەڵگە لە رووی پێشکەوتنیانەوە لەم مەیدانەدا بە کۆمەڵگەی پیشەسازی گەورە ناودەبرێن، هەروەها هەندێك شاری بچووکیش بەرەبەرە پێشکەوتنو گەورە شارەکان زۆر بوون، بەرادەیەك کە هەندێ شار ژمارەی دانیشتوانی گەیشتە چەندان ملیۆن کەسو لە رووی تەکنەلۆژیاوە بەشاری ئەلەکترۆنی ناو دەبرێن.

پەرەسەندنی پیشەسازی کارێکی گەورەی کردە سەر ژیانی ئابووری گوندەکان، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی گوندەکان کۆچیان کرد بۆ شارەکان بە پیشەسازییەوە خەریك بوون، ئەم کۆچکردنەش بووە هۆی کەمبوونەوەی دانیشتوانی گوندەکان. ئەم گۆڕانکارییە بووە هۆی گۆڕانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە ڕاستەوخۆییەکان هەڵوەشایەوە. پەیوەندی لاوەکی شوێنی گرتەوە، واتە پەیوەندی لەنێوان خەڵکەکە لەسەر سوودو قازانجی هاوبەش دامەزرا. ئاڵۆزبوونی ژیانو زۆربوونی پێداویستییەکان وای لە مرۆڤ کرد کە نەتوانێ ئامادەیان بکات.

دابەشکردنی کاروباریش مانای دەرکەوتنی شارەزایی (پسپۆری)یە کە بەهۆی ئەمانەوە پێداویستییە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ ئامادە کرا، کەواتە دابەشکردنی کاروبار بەجۆرە هاوکاریو یارمەتییەك لە نێوان ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەدا دادەنرێت.

ئەم گۆڕانە مێژووییەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی وەك سەرنجماندا بەچەند قۆناغێکی هەمەجۆری تێپەڕبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قۆناغەکانی پێش قۆناغی پیشەسازی سیماو خەسڵەتی خۆیان پاراستووە واتە تا ئێستاش کۆمەڵگەی وا هەیە کەکاری سەرەکییان ڕاوو ئاژەڵداری و کشتوکاڵییە. ئەمانەش هەمووی بەیەکەوە بەندن، چونکە پیشەسازی دەبێتە هۆی پێشکەوتنی بەرووبوومی ئاژەڵداریو زیادبوونی بەرهەمی کشتوکاڵی.

## پرسیارەکان

١- مرۆڤی سەرەتایی کەلە ئەشکەوت هاتە دەرەوە چی دروستکرد؟

٢- یەکەم بەرهەم لە دوای ڕاوکردن چی بوو؟ چۆن بوو؟

٣- باسی سەرهەڵدانی قۆناغی پیشەسازی سەرەتایی بکە؟

٤- چۆن قۆناغی پیشەسازی کاری کردە سەر ژیانی لادێ؟

٥- ئایا قۆناغی ئاژەڵ بەخێوکردن لە قۆناغی ڕاو باشترە بۆچی؟

٦- یەکەم کۆمەڵگەی مرۆڤ چۆن لەسنووری خێزان چووە دەرەوە؟

### ڕاهێنان

هەندێك لە هزر ڤانان ڕایان وایە کۆمەڵگە بەم قۆناغانەی خوارەوە تێ پەڕیوە:



# بەندی سێیەم

# پەیوەندییەکان

پەیوەندی کۆمەڵایەتی یەکێکە لە بنچینە بنەڕەتییەکانی پێکهاتنی کۆمەڵو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ئاستی هەندێك لە خاوەن بیرەکان، بنچینەیەکی سەرەکییە کە کۆمەڵگای لەسەر دامەزراوە، یان کۆمەڵگە پوختەی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەی کۆمەڵو ڕۆڵەکانی کۆمەڵ بەیەکەوە دەبەستێت، بۆیە هەمیشە هەوڵ دەدەن بۆ پێکهێنانی سیستەمێك کە ئاراستە کردنو ڕاگیرکردنی ڕەفتاریان لەگەڵ یەك ڕێك بخات، ئەرکی ئەم سیستەمە ئەوەیە کەڕێ بە چالاکی بداتو لەهەمان کاتیشدا سنووری بۆ دابنێت، چونکە ئەو سیستەمە ئەوانە دەست نیشان دەکات کە پێویستە بکرێنو ئەوانەیش کە نابێت بکرێن.

بۆ ئەوەی گرنگی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەباشی دەربکەوێت با کۆمەڵە کەسانێك بێنینە بەرچاومان کە ژیانیان لەسەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی دانەمەزرا بێت، ئەم جۆرە کۆمەڵانە لە ئەنجامی نەبوونی ئەو پەیوەندییانەوە لەناو دەچن کە ئەرك و مافو نەریتو چەشنی هاوکاری نێوانیان و ئامانج و ڕەوشتە گشتییەکانیان دیاری دەکات، کۆمەڵێك لەم جۆرە پێی ناوترێت کۆمەڵ، چونکە ژیانیان لەسەر پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئاشکرا دانەمەزراوە، ئەم کۆمەڵانە تووشی هەڵوەشانەوەو لەناوچوون دەبن، کەوابوو پەیوەندی کۆمەڵایەتی تەنها بۆ ڕوویەکی دیاریکراوی کۆمەڵ نییە، بەڵکو هەموو ژیانی کۆمەڵ دەگرێتەوە، هەر ئەوەشە کەسنوور بۆ ڕەفتاری ژن بەرامبەر بە مێرد دیاری دەکات و ڕەفتاری قوتابی لە قوتابخانەو ڕەفتاری منداڵان بەرامبەر بە باوكو دایکیان و ڕەفتاری سەرباز لە ڕۆژانی شەڕو ئاشتی، هەروەها ئەو

پەیوەندییەی نێوان دەستە جیاجیاکانی کۆمەڵگە دروست دەکاتو مانـەوەی دابین دەکات.

**چالاکی:** لە نموونەی پەیوەندی سۆزو دۆستایەتی پەیوەندی نێوان ............... ، ...............
لە نموونەی پەیوەندی ئابووری پەیوەندی نێوان ............... ، ...............

هەروەها نەخشەی نیشانە گشتییەکانی بۆ دادەنـێ کـە جیـای دەکاتـەوە لـە کۆمـەڵانی تـر. لەمـەوە گرنگـی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی ژیـانو بـەردەوامی کۆمەڵگە دەردەکەوێت، پەیوەندی کۆمەڵایەتی لـە هـەموو کاتێکدا وەك یـەك نییە، ئەگەر کۆمەڵەکە سـەرەتاییو سـاکار بـوو، پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی لـە ناویانـدا سـاکارو دیـاریکراوە. ژیـان لـەناو ئـەم کۆمەڵانـە بـەوە ناسـراوە کـە پێویسـتییە کۆمەڵایەتییـەکانیان کەمـە، وەکـو نەریتیشـیان پەیوەنـدی کۆمەڵایەتییان دیاری دەکات، بەڵام ئەگەر کۆمەڵ ئـاڵۆز بـوو یـان کۆمـەڵێکی نـوێ بـوو ئـەوا پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتییان ڕوو لـە ئاڵۆزییـە، بـە هەنـدێکیان دەوترێ پەیوەندی ئابووریو هەندێکیتر شەخسـیو هەنـدێکیتر دۆسـتایەتیو یان دوژمنایەتی، وەك پەیوەندی ژنو مێردێتیو هەنـدێکیتر، یـان هەنـدێکیان گونجاندنی سودو قازانج ڕای گرتوو، وەك پەیوەندی نێوان کرێکاران خۆیـان، یان هەندێکیتر لە پەیوەندی کە ناگونجێت لە بەرژەوەندی دا وەك : پـۆلیسو تاوانبار.



بەگشتی پەیوەندی كۆمەڵایەتی دەكرێت بە دوو بەشەوە:

١- پەیوەندی ڕاستەوخۆ:

ئـەو پەیوەندییـە دەگرێتـەوە لـە نێـوان تاكـەكانی یـا ئەنـدامانی كۆمـەڵێك كەلەسـەر بنچـینەی سـۆزو خۆشەویسـتیو پەیوەنـدی خـوێن دامـەزراوە، پەیوەندێكی بەردەوامە زۆر جار ئەم پەیوەندییە پیرۆزیی خۆی هەیە لە چوار چێوەی خێزانی گەورەو بچووك واتە پەیوەندی لە نێوان دایكو خوشكو بـراو خزم و كەسی پلە دوو.

**چالاکی:**

پەیوەندی ڕاستەوخۆ وەکو پەیوەندی نێوان

أ- دایك و [ ]

ب- برا و [ ]

جـ- باوكو [ ]

### ٢- پەیوەندی لاوەکی:

ئەم پەیوەندییە لە ئەنجامی یەکتر ناسینو تێکەڵاو بوون بە شێوەی ناڕاستەوخۆ دەبێت، ئەم سۆزو خۆشەویستییە لەسەر بنچینەی نزیکایەتی خوێن نابێت، بەڵکو لەسەر بنچینەی ئەرکو مافی سەرشان لە بەرامبەر یەکترو کۆمەڵ دروست دەبێت وەکو پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابیو فەرمانبەر بەرامبەر خاوەن کارەکەیو فەرمانگەکەی هێزی پارێز بەرامبەر خاك و نیشتمان. هەر لەبەر ئەوەشە بەم پەیوەندییە وتراوە پەیوەندی فەرمی (ڕەسمی)، چونکە بنچینەکانی بەدیهێنانی ئەرکی تاکە لە کۆمەڵداو ئەو ئەرکانەی لەسەریەتی بەرامبەر بە کەسانی تر بەبێ لادانو جیاوازی کردن. لە ئەوانەی لەسەرەوە باسمان کردن بۆمان دەردەکەوێت کە پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان هەوڵی بەدیهێنانی گەلێ لە ئامانجە گرنگەکانیان داوە وەکو:-

١- ڕۆشنبیری کۆمەلایەتی وامان ڕادەهێنێ کە ڕەفتارو ڕەوشتمان بەرەو سوودو قازانجی ڕۆڵەکانی کۆمەڵ ئاراستە بکەین.

٢- پەیوەندی کۆمەڵایەتی مرۆڤ ڕادەکێشێت بەرەو تێگەیشتنی ماناو نرخی جیاواز کە بەسیستەمی کۆمەڵگەوە بەستراوەو وای لێدەکات کە ژیانی بە پێی ئەم سیستەمە بگونجێنێت.

٣- لێکۆڵینەوەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی یارمەتی ئەوەمان دەدات کە لە گیروگرفتەکانی کۆمەڵ بگەین کە بەهۆی ئەمەشەوە یارمەتی دانانی نەخشەو پلان دابنێین بۆ چارەسەرکردنی ئەو گیرو گرفتانە.

**چالاکی:** لە نموونەی پەیوەندی لاوەکی

أ- پەیوەندی نێوان مامۆستاو

ب- پەیوەندی نێوان فەرمانبەرو

٤- کە لە پەیوەندی کۆمەڵایەتی گەیشتین دەکەوینە سەر لێکۆڵینەوەی دیاردەکانو ڕووداوە مێژووییەکانی کۆمەڵ، کە ئەمەش ڕێگایەکی زۆر گرنگە بۆ زانینی باری ئێستای کۆمەڵ.

٥- پلاندانان بۆ دواڕۆژ کە پشت بەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە دەبەستێت کەلەناو کۆمەڵدا باون. وەك ئەو گۆڕانکارییەی بە ئامانجی پێشخستنی کۆمەڵایەتییەوە بەندن لە ڕووی باشیو چالاکی تاكو کۆمەڵ.

**ڕاهێنان**

لە نموونەی پەیوەندییەکان، بۆ هەریەکەیان دووان بنووسە:

| پەیوەندی ڕاستەوخۆ | پەیوەندی ناڕاستەوخۆ |
| --- | --- |
| وەکو: | وەکو: |
| ١- ........ | ١- ......... |
| ٢- ........ | ٢- ......... |

## ئەرك‌و مافەکانی کەسەکان لە کۆمەڵدا:-

هەنــدێك لــە خــاوەن هــزرە کۆمەڵناســەکان دەســتیان کــردووە بــە لێکۆڵینەوەی تاکە کەس‌و کۆمەڵ، هەریەکەیان بەتەنها، هەندێکیان بایەخیان بە تاکەکەس داوە، بـەڵام هەنـدێکی تریـان بەرژەوەنـدی کۆمـەڵیان خسـتۆتە پێش بەرژەوەندی تاکە کەس، ئەوانەی گرنگیان بە تاکە کـەس دەدا، دەیـان گوت تاك پێش کۆمەڵ هەبووە بنچینەی پێکهاتنی کۆمـەڵ تاکـە کەسـە، کـە بەبێ تاکەکەس کۆمەڵ پێك نایەت، بۆیە دەبێت تاك بەرژەوەنـدی بپارێزرێـت لە ڕێگای ئاسایشی تاك‌و ڕەخساندنی هەموو فاکتەرەکانی خۆشگوزەرانی بـۆ ئایندەیـەکی گـەش، بـەڵام بەشـی دووەم لـە خـاوەن بیرەکـان کـە بایـەخ بـە کۆمەڵ دەدەن بڕوایان وایـە کـە تاکەکـەس بەرهـەمی کۆمەڵـە، چـونکە تاکـە کەس بەتەنها هیچی پێ ناکرێ‌و کۆمەڵ تاکە کەس ئامادە دەکـات بـۆ ژیـانی کۆمەڵایەتی‌و حەسانەوەو پاراستنی بۆ دابین دەکات. هەموو تواناو بلیمـەتیی

پێدەبەخشێ تا دەیکاتە مرۆڤێك بە مانایەکی تەواو. لە هەموو کۆمەڵگاکانی جیهاندا تاکە کەس‌و کۆمەڵ مافی تایبەتییان هەیە، لەبەر ئەوەی ئەم بەشە زۆر باسی مافی تاکە کەس دەکات لە کۆمەڵدا مانای (ماف) لە چوارچێوەی بە هاونیشتمانی بووندا مانایەکی زۆر فراوانی هەیە، چونکە ماناکەی بەپێی جیاوازی کۆمەڵەکان دەگۆڕێت، ئەو کۆمەڵانەی کە زۆر پێشکەوتوون مافێکی زۆریان داوە بە تاکە کەس کە لە کۆمەڵانیتر بەدی ناکرێت، بەڵام لە هەندێ کۆمەڵێتردا دەبینین دەست نراوەتە بینی رۆڵەکانی‌و لە بچووکترین مافی مرۆڤ بێبەشن.

**چالاکی:** من هاووڵاتی کوردستانیم:

ئەرکەکانی سەر شانی من بەرامبەر بە نیشتیمان

١- ............ ٢- ............ ٣- ............

**لەگەڵ ئەمانەشدا لەناو کۆمەڵەکانی جیهاندا هەندێ مافی ناسراو هەن وەکو:**

**١- ماف‌و سەربەستی.**

ئەو کۆمەڵەی کە ماف‌و سەربەستییەکی فراوان، بە رۆڵەکانی دەبەخشێ، لەکۆمەڵانی تردا لە رووی جۆری رەوشتی تاکە کەس جیایە لەم کۆمەڵانەدا تاك بۆی هەیە خۆی ئەو کارو رۆشنبیرییە کە دەگونجێت لەگەڵ توانای بیرو رای هەڵبژێرێت، و هەموو مافێك نابێت بە رەفتاری ئەوانە بێت کە هەموو لەسەری رێککەوتوون، چونکە تاك سەرەرای ئەوەی کە خاوەنی ئارەزووی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام ئەو کەسە لەهەمان کاتیشدا بەشێکە لە کۆمەڵی گەورە، کەواتە لەسەریەتی پەیرەوی ئەو شتانە بکات کە لەسەری

پێکهاتوون. و ئەمانە گرنگترین نیشانە گشتییەکانی مافو سەربەستی تاکە کەسن لە کۆمەڵدا، کە بریتین لە ژیانو خوێندنو پاراستنو ڕادەربڕین و پاراستنی تەندروستی و جۆری جلوبەرگ و خوا پەرستیو چوونە ناو کۆمەڵانو سەندیکا بە هەموو جۆرەکانییەوە هەموو دەستوورو یاسایەك لە جیهاندا دانی بەم مافو سەربەستییانە داناوە، چونکە زۆر گرنگە بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان تاكو کۆمەڵ.

**ڕاهێنان**

((سەربەستی)) ئازادییە یان بەرەڵڵاییە یان پابەندبوونە بە بەها.

تۆ: وەڵامی ڕاست هەڵبژێرە

**- یەکسانی.**

یەکسانی بە مافێکی گرنگی نەوەکانی گەل دادەنرێت لەناو کۆمەڵدا، چونکە بەڵگەی دادپەروەرێتی کۆمەڵایەتییە لەبەدەستخستنی هەلو دەرفەت بۆ هەموو هاونیشتمانییەك لەناو کۆمەڵدا بەهۆیەوە هاوکاریو پشتگیری کۆمەڵایەتی پلەی بەرز دەبێتەوە لەناو ڕۆڵەکانی کۆمەڵداو بڕوای جەماوەر بەدەسەڵاتی هەڵبژێردراوی دەسەڵات زیاتر دەکات.

**چالاکی:**

دوو گرووپ لە قوتابیان دوو ڕاپۆرت لە بارەی ((ماف و سەربەستی)) و (( یەکسانی)) ئامادە دەکەن، بۆ وانەی داهاتوو گفتوگۆی لەسەر بکەن.

## پرسیارەکان

١- گرنگی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە دروستبوونی کۆمەڵدا چییە؟

٢- باسی سێ نموونەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە شارەکەت بکە؟

٣- مەبەست لە پەیوەندی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ چییە؟

٤- مەبەست لە یەکگرتنی کۆمەڵایەتی چییەو ڕوونی بکەوە؟

٥- بۆچی پێشکەوتنی زانیاری بۆ بەختیاری کۆمەڵ پێویستە؟

٦- بۆ گۆڕینەوەی زانست مەرجە کۆمەڵگەکان هاوکاری یەکتر بکەن؟ بۆچی؟

بەندی چوارەم

# کۆمەڵگای شارستانی

کۆمەڵگای شارستانی ئەو کۆمەڵگایەیە کە تاکەکانی توانیویانە بگەنە ڕادەیەکی وای پێشکەوتن کە بەئاسانی لە کۆمەڵگاکانی تری دراوسێ جیا بکرێنەوە. جا ئەم پێشکەوتنە چ لە بواری بیری یا کلتووری یا فەرهەنگی یا زانستی یا بیناسازی یا ئەخلاقییەوە بێت یا هەر بوارێکیتر کە بەهۆیەوە بتوانرێت خەسڵەتێك لە خەسڵەتەکانی شارستانی لەخۆی بەرجەستە بکات و لە کۆمەڵگایەکی تری مرۆڤی جیا بکرێتەوە.

کەواتە شارستانییەتی کۆمەڵگا خۆی لەو دەسکەوتە زۆر هەمەلایەن‌و جیاجیایانەی کۆمەڵگاوە دەبینێتەوە کە تاکەکانی بە هەوڵ‌و ماندوبوونی چەندین ساڵەیان بەدەستیان هێناوە، یاخود توانیویانە سوود لە دەستکەوت‌و شارستانیەتی دراوسێکانیان وەربگرن و هەندێ گۆڕانکاری ئەرێیانەی (ایجابی) تێدا بکەن‌و دووبارەو لە بەرژەوەندی کۆمەڵگاکەیان بەکاری بهێنن. ئەو کۆمەڵگایانەی کەڕادەی پێشکەوتنی شارستانییان لە کۆمەڵگایەکی‌تر بەهەر هۆیەکەوە بێت لە پێشتر بێت، دەبینین ڕادەی جموجۆڵی تاکەکانیان‌و ڕادەی گەشەسەندنی زانستی‌و بیناسازی‌و کلتووریان لەچاو کۆمەڵگاکانی تر لە پێشترە، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کەوا بە شارستانی بوونی کۆمەڵگا چەندە لە بەرژەوەندی ئێستاو داهاتووی کۆمەڵدایە.

نەتەوەی کوردیش وەك نەتەوەکانیتر خاوەن شارستانییەتی خۆیەتی، لەپاڵ ئەوەشدا لەگەڵ نەتەوەکانی دراوسێیدا بەشداری چالاکی لە بونیاتنانی شارستانییەتی ناوچەکە هەبووە، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کۆمەڵگای

کوردستانی چەندە کۆمەڵگایەکی شارستانیو چەندە کۆمەڵگەیەك بووە دژ بە هەموو ڕووکارێکی ناشارستانی، ئەوەتا مێژووی نەتەوەکەمان بریتییە لە سیماکانی شارستانیو ئاواکاری و ڕەوانبێژی و ئەدەبو زانست، بەڵام ئەوە نەیارانی کۆمەڵگای کوردستانین بیری نەتەوە پەرستیو تەماحکارانەیان بڕیوەتە کۆمەڵگای کوردی و زۆرێك ڕووکاری شارستانیو مرۆیی و زانستی هەیە بە درێژایی مێژوو لەناو بردووەو کلتوورو شارستانییەتی خۆیان بەسەردا سەپاندووە، بەمەبەستی شێواندنی ناسنامەی نەتەوەییمان.

کۆمەڵگا شارستانییەکان بێ بنەماو بناغەی دیاریکراو نایەنە دامەزراندن، ئەو بنەمایانەش لە هەریەك لەو کۆمەڵگایانەدا بەدی دەکرێن مەرج نییە لە ڕووی ناوەرۆکەوە لەیەك بچن، چونکە هەر کۆمەڵگایەو بنەمای تایبەتو بنەمای گشتییان هەیە، لێرەدا گرنگترین بنەماکانی کۆمەڵگا شارستانییەکان لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا دەتوانین کورت بکەینەوە:

**چالاکی:** لە خەسڵەتەکانی کۆمەڵگەی شارستانی:

**یەکەم:** پێشکەوتنە لە ڕووی ..................

**دووەم:** پێشکەوتنە لە ڕووی ..................

### ١- بنەمای ئاواكاری ( العمرانی ):

واتە بوونی بارودۆخێكی مرۆیی وا كە تاكەكانی ئەو كۆمەڵگایە بتوانن كۆمەڵی ئاواكاری وا دروست بكەن، بە شێوەیەك هێمنی ئاسایش بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ بەرقەرار بووبێ و پرۆژەكانی ئاوەدانیو بژێوی فەراهەمكراو بێت تاوەكو ئەندامانی كۆمەڵگا كە بواری بۆ داهێنانیان بۆ برەخسێ.

**چالاكی:** لە نموونەی ئاواكاری:

أ- گەشەپێدان بە پرۆژەكانی ژێرخانی ئابووری.

ب- پرۆژەكانی (ژێرخانی ئابووری) وەكو چیی؟

### ٢- بنەمای ئابووری:

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە هەریەكە لەو كۆمەڵگا شارستانییانە خاوەن ئابوورییەكی تایبەت بە خۆیانن و چۆنیەتی بەرهەمهێنانو دابەشكردنی بەرهەم، ئامرازەكانی بەرهەمهێنان دەگرێتەوە، بۆیە سەیر نییە لانەی كۆمەڵگا شارستانیە گەورەكان نزیك رووبارو سەرچاوەی ئاوەكان بێت، چونكە یارمەتی پرۆژەكانی ئاودێریو ئاواكاری كۆمەڵگا دەدات.

### ٣- بنەمای رۆشنبیری و كلتوری:

ئەگەر سەیری كۆمەڵگا شارستانییەكان بكەین، دەبینین هەریەكەیان كلتورو رۆشنبیرییەك پیادە دەكەن جیا لە كۆمەڵگایەكی تر، ئەمەش خۆی لە شێوازی نووسینو قسەكردنو جلپۆشینو دابو نەریتی كۆمەڵایەتیو

سەرجەم ڕەفتاری تاكەكانی ئەو كۆمەڵگایە دەبینێتەوە كە دەبینین لە هەریەكە لەو كۆمەڵگا شارستانییانە بە جۆرێكەو لەوەیتر جیاوازە.

## ٤- بنەمای بیریی ( فیكری ):

ئەمە بنەمایەكی گرنگە، چونكە كاریگەری ڕاستەوخۆی بەسەر بنەماكانی ترەوە هەیە. مەبەستمان لە ڕادەی ئەو بیروڕایانەیە كە كۆمەڵگاكە پێگەیشتووە لە چوارچێوەی بەرجەستەكردنی بیرێك لە چوارچێوەیەكی دیاریكراو، كارپێكردنی بەشێوەیەكی ئارەزوومەندانە یا بە زۆرەملێ.




## ٥- بنەمای ئایینی:

لەبەر ئەوەی ئایین ڕۆڵێكی گەورە لە ڕێكخستنی كۆمەڵگا دەگێڕێ، بۆیە سەیر نییە لە كۆمەڵگا شارستانییەكاندا ئایین بۆتە بنەمایەكی گرنگی بەڕێوەبردنو ڕێكخستنی ژیانی ڕۆژانەی خەڵك، لە هەریەكە بەو كۆمەڵگا شارستانییانەدا دەسەڵاتدارن دەستیان بە ئایینێكەوە گرتووە یاخود هەوڵیانداوە ئاینێك بۆخۆیان بسازێنن.

### ٦- بنەمای زانستی و فەلسەفی:

ئەمەش بنەمایەکی گرنگی کۆمەڵگا شارستانییەکانە، چونکە کاریگەری بەسەر ڕادەی بەرهەمهێنانو ئاراستەکردنی بەڕێوەبردنو ڕەفتاری تاکەکانی کۆمەڵەوە هەبووە، ئەوە بیرە زانستیەکانن پرۆژەی بەنداوەکانی سەر ڕووبارەکان و ئامێری بەرهەمهێنانی نوێ دادەهێنن، ئەوە بیرە فەلسەفییەکانن ڕەخنە لەبیروڕا کۆمەڵایەتییەکان دەگرن و خوازیاری چاکسازی و گۆڕانکارین.

### ٧- بنەمای یاسایی:

یاسا بنەمایەکی گرنگی ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤەکانە، بۆیە کۆمەڵگا شارستانییەکان، سەرەتاکانی یاسادانانیان بۆ خۆیان داهێناوەو ئەم یاسایانەش سەرەتا بەشێوەیەکی ڕێکەوتن یا پەیمان بووە و دواتر لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە بۆ دەقی یاساییو سەپێنراوە.

**چالاکی:** بۆ ڕاڤەکردنی ڕۆڵی یاسا دەکرێت، میوانداری یاسا ناسێك بکرێت بۆئەوەی سیمینارێك لە قوتابخانەکەدا لەمبارەیەوە سازبدات.

### ٨- بنەمای دەسەڵات (حوکم):

مەبەستمان لەم بنەمایە ئەوەیە کە لەهەر یەکە لەو کۆمەڵگا شارستانییانە بەڕێوەبەرایەتییەك هەیە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری خەڵکیو چارەسەرکردنی گرفتو ڕووداوەکان و سەرکوتکردنی نارەزایەتییەکان، لەو

حـوكم كردنەشـدا دەسـەڵاتداران پشـت بـە یاسـا دانراوەکـانو دامـەزراوە کۆمەڵایەتییەکانو دامەزراوی سوپایی دەبەستێ.

**ڕاهێنان:**

ئەگەر کۆمەڵگەیەك دەزگاکانو دەسەڵاتی تێدانەبوو، چی ڕوو دەدات؟

بۆچی (( بوونی دەسەڵات)) پێویستە؟

# بەندی پێنجەم
# یاساکانی کۆمەڵگا

**پێناسەی یاسا:** ئەو ڕێکەوتنە گشتییەی کۆمەڵگایە لەسەر چەند دەقێك کە لەبەرژەوەندی خەڵك دایە، جا ئەو دەقە نووسراو بێت یا زارەکی، ئامانج لە دانانی یاسا ڕێکخستنی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکە لەسەر ڕێڕەوێکی دروستو دیاریکردنی ڕەفتارو کردەوەکانمانە بە ئاراستەی باشترکردنی هەڵسوکەوتەکانمان و جیاکردنەوەی ماف و ئەرکی هەر تاکێکی کۆمەڵگایە.

لە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکاندا، یاسا ڕۆڵێکی گرنگو بەرچاوی گێڕاوە لە ڕێکخستنو ئاراستەکردنی هاوولاتیانو بە ئاکاری باشترکردنی پەیوەندی مرۆڤ بەبرای مرۆڤیەوە. یاساکانی کۆمەڵگا بۆ ئەوە دادەنرێن تاکو ئەرکو مافی هەر یەکێك لە ئێمە دیاری بکات و هەریەکەمان بزانی چی ئەرکێکی لە سەرەئەنجامی بداتو چ مافێکی هەیە داوای بکات. بۆیە تێگەیشتن لە گیانی یاساکان تێگەیشتنە لە ئەرکو مافەکان، هیچ کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی نادۆزینەوە توانیبێتی دەست بەرداری یاسا بووبێ و ڕەمەکییانە کاریان کردبێ، با ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی سەرەتایش بووبێ. چەندی یاسا لە کۆمەڵگا بەر قەرار بێ ئەوەندە ئەو کۆمەڵگایە دەتوانێ کاروبارەکانی خۆی ڕێکبخاتو بواری کارکردنو دابینکردنی پێداویستییەکانی خەڵك ئامادە بکات یاساکان بە گوێرەی ڕادەی پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان زۆر ئاڵۆز دەبن، چونکە چەندی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی داهێنانی نوێ بهێنێتە کایەوە، ئەوەندە پێویستی بە داڕشتنی دەقی یاسایی نوێ دەبێ، بۆیە سەیر نییە ببینین کۆمەڵگا سەرەتاییەکان لەچاو کۆمەڵگاکانی ئێستامان دەقە یاساییەکانیان بە گوێرەی ژیانی سادەیی خۆیان ڕێکخستبوو، هەروەها چەند کێشە

کۆمەڵایەتییەکان‌و ئابوورییەکان‌و ڕامیارییەکان زۆر بن، ئەوەندە یاساکانیش زۆر دەبن بۆ چارەسەرکردنی ئەوکێشانە.

لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بەچەند نموونەیەکی یاساکانی کۆمەڵگا بکەین‌و گرنگی ئەو یاسایانەمان بۆ دەربکەوێت، یاساکانی ڕێکخستنی ژیانی هاوسەرێتی کە گرنگی دەدات بە دروستکردنی خێزان‌و دیاریکردنی مافی هەریەکە لە ژن‌و مێردو مناڵ. هەروەها یاساکانی هاتووچۆ کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی داهێنانی ئۆتۆمبێل کە گرنگی دەدات بە ڕێکخستنی هاتوچۆی هاووڵاتیان بە ئۆتۆمبیلەکانیان‌و چۆنیەتی بەکارهێنانی ڕێگاکان‌و سزای سەرپێچی کاران دەدات. بەتایبەتی ئەوانەی ڕێزی نیشانەکانی هاتووچۆ کردن ناگرن.

**ڕاهێنان**

یاسا بۆ ڕێکخستنی ژیانی ڕۆژانەمان ئامادە کراوە چەندین جۆری یاسا هەیە لە وانەش:-

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| یاسای هاتوچۆ | و | | و | |

یاساکانی سزادانی تاوانباران لەسەر دزی‌و کوشتن، هەر دیسان یاسای کۆمەڵایەتی گرنگن بە هۆیەوە، بێ تاوان دەتوانێ داوای مافی خۆی بکات لە دادگاکان‌و سزای پێویست بۆ تاوانبار دیاریدەکات، کە هەندێکیان بە بەندکردن‌و هەندێکیان بە ژمارەیەکی زیانەکان تەواو دەبێت.

کەواتە یاساکانی کۆمەڵگا بۆئەوە داهێنراون تاکو هەر تاکێکی کۆمەڵگا لە خۆیەوە کارێك ئەنجام نەدات دژ بە بەرژەوەندی خەڵکیو کەسی زیان لێکەوتووش نەتوانێ بە ئارەزووی خۆی مافی خۆی وەربگرێت، چونکە پابەندبوون بەم یاسایانە گێرەشێوێنی دەخولقێنی و بەرەڵڵایی لێدەکەوێتەوە، بۆیە لەسەر هەموو ئەندامانی کۆمەڵ پێویستە رێزی یاساکانی کۆمەڵگا بگرنو لە رێگای یاساکانەوە مافەکانیان داوا بکەنو هەر لەرێگای یاساکانەوە ئەرکیان بەسەردا دەسەپێ.

## راهێنان

| ب | أ |
|---|---|
| هەروەها یاسا بەرژەوەندییەتی | یاسا بەرژەوەندییەکانی |
| ......... دەپارێزێت | تاك دەپارێزێت |

## چالاکی

**مامۆستای بەڕێز:** بە هاوکاری ئیدارەی خویندنگا دەتوانێت میوانداری:-

١- ئەفسەرێکی یاساناسی (هاتووچۆ) بکرێت.

٢- گفتوگۆ لەگەڵ قوتابییانی پۆلێك یان قوتابخانەکە دەکات.

## بەندی شەشەم
## دابینکاری کۆمەڵایەتی

### أ- دابینکاری کۆمەڵایەتی :

ئەنـدامانی کۆمەڵگـە چـەند پەیوەندییـەکی کۆمەڵایـەتی پێکیانـەوە دەبەستێتەوە کە کۆمەڵێك ڕێبازو ڕەفتارو پەیوەندی کۆمەڵایـەتی دەسـتیان بەسەریدا گرتووە ئەوانیش داب و نەریتو ڕەوشتی باوی کۆمەڵایەتیو باوەڕو ئـاینو یاسـاکان و دەزگـا کۆمەڵایەتییـەکان هـانی ئەندامـەکان دەدات بـۆ فێربوون و پەسندکردنی پێوەرە کۆمەڵایەتییـە دروسـتەکانو داب و نـەریتو ڕەوشـتە چـاکەکان. کۆمـەڵگای مرۆڤایـەتی یاریـدەی ئەندامـەکان دەدات بـۆ تێرکـردنو مسـۆگەرکردنی پێویسـتییەکانی لەگـەڵ ئەمەشـدا کۆمەڵگـەکان پێویسـتە تایبەتییـەکانی خۆشـیان هـەبێت ئـەو مەرجانـەش بـۆ مانـەوەی کۆمەڵگە پێویستی بەمانەی خوارەوە هەیە:-

١- دەبێت پەیوەندییەکانی کۆمەڵایەتی لە نێوان ئەندامـەکانی کۆمەڵگـە لـە ئارادابێت بۆ پێکهێنانی کۆمەڵایەتی.

٢- دەبێت کەرەسەو خزمەتگوزاری بەرهەم بهێنێت بۆ تێرکردنی پێویسـتییە سروشتی دەروونییەکانی ئەندامانی کۆمەڵ بـەپێی  توانـاو بەشـێوەیەکی دادپەروەرانە بەسەریاندا دابەش بکرێت.

٣- ئەندامەکانی کۆمـەڵ لـەو مەترسییانە بپـارێزن کـە بـەهۆی دەورووبـەری سروشتیو کۆمەڵایەتی کە توشیان دەبێ.

٤- لەبەر ئەوەی کە مردن دوائـەنجامی هـەموو مرۆڤێکـە دەبێـت لـەبری ئـەو زیانانەی لەم بارەیەوە تووشیان دەبێت زیانەکەیان بدرێتێ.




٥- ئەندامەکانی کۆمەڵ لەژێر جۆرێك لە چاودێری کردنو ڕێکخستنو دابینکرندا بین.

### ب- دابینکاری لە دوو توخمی سەرەکی پێك دێت:

١- بوونی کۆمەڵێك پێوەرو بەهای کۆمەڵایەتی کە ڕەفتاری دروست لە ڕەفتاری چەوت جیا دەکەنەوە بە پێی ئەمەش خەڵك بڕیاری خۆیان لەسەر ڕاستیو چەوتی کارو کردەوەو بیری خۆیانو خەڵکی تر دەدەن.

٢- بوونی خەڵاتو سزا بۆ هاندانی خەڵك تا بە ڕێگایەکی پەسندی کۆمەڵایەتییانە ڕەفتار بنوێنن. ئەمەش دوو جۆرە.(چاك) : کە کۆمەڵگاکە ڕەزامەندی خۆی بەرامبەر بە ڕەفتاریان دەردەبڕێت لە شێوەی خەڵات، پاداشت وەك : بەخشینی مەدالیاو، نیشانەی خەڵات ئەوی دیکەیان (خراپ): کە کۆمەڵگە نارەزاییو تووڕەیی خۆی بەرامبەر ڕەفتاریان دەردەبڕێت، ئەمەش لە نێوان بە سووك تێڕوانینو ڕسواکردنەوە، تاکو دەگاتە بەندکردن و دوورخستنەوە لە کۆمەڵگەدا.

ئەگەر بەتەنیایی پشت بەخەڵات کردنو سزادان ببەستێت واتا پشت بەوە ببەستێت کە ئەندامانی کۆمەڵ هەندێکیان بەسەر ئەوانی دیکە دەیسەپێنن.
ڕاستی وایە هەر یەکێك بەشێکی گەورەی بەرپرسیارەتی ڕەفتارەکانی لە ئەستۆی خۆی بگرێت. نێر بێت یا مێ. خۆیان چاودێری خۆیان بکەنو دەتوانن بڕیاری خۆیان بەسەر خۆیان بدەن وەك ( هەست بە تاوان کردنیان یان شانازی بە خۆوەکردن).
ئەمە بایەخی ئەرکی پێگەیاندنو پەروەردەی کۆمەڵایەتیمان بۆ دەردەخات. ئەندامانی کۆمەڵ ڕێزی پێوەرو کۆمەڵایەتییە بنچینەییەکان دەگرنو پێیان قایل دەبن بۆ نموونە: ئەندامانی خێزان لەسەر گوێڕایەڵی دایكو باوك ڕاهاتوون.

**ڕاهێنان**

١- ئەگەر قوتابی چالاکییەکی سەرکەوتووی ئەنجام دا دەبێت .......... بکرێت.

٢- ئەگەر هاووڵاتی کارێکی خراپی ئەنجام دا دەبێت .......... بدرێت.

٣- ئەگەر (سزاو) و (خەلات) نەبێت چیی ڕوو دەدات؟

لەگەڵ ئەوەشدا لە قەتابخانەدا فێری ڕەفتاری جوانو چاك دەبن ولەسەر شەقامیشدا پەیڕەوەی ئامۆژگارییەکانی هاتوچۆ کردن دەبێت و لە بواری کارکردندا فێری ملکەچی یاسا دەبێت واتا مرۆڤ لە ژیانی ئاساییدا لە (ئەکتەرێکی) سەر شانۆ دەچێت، بەڵام سەربەست هەڵسوڕانی پترە کەچی

کورت و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەموو لایەکەوە دەوری دەدەن و ئەمەش لە کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکی دی دەگۆڕێ.




**ئەو هۆیانەی کاردەکەنە سەر دابینکاری کۆمەڵایەتی ئەمانەن:**

**١- ڕای گشتی.**

**٢- سەرکردایەتی.**

**٣- یاسا.**

**٤- ئایین.**

بەکورتی باسی ئەم چوار لایەنە دەکەین:

**١- ڕای گشتی:**

ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەر لە پاڵپشتیکردن لە بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان دەگێڕێت، بریتییە لەو گوزارشتە ئاشکراو ڕوونەی کە کاردانەوەی لەسەر تێڕوانینی زۆرینەی کۆمەڵ دەبێت لەبەرامبەر کێشەیەکی دیاریکراو و لەکاتێکی دیاریکراو. یاخود چاو گێڕانەوە بەو هەڵوێستانە کە کۆمەڵگە پێیان پەسند نییە، بە تایبەتی کاتێ هەست بەتوڕەیی و هەڵچوونی کۆمەڵگە

دەكرێ و لە بەرامبەریدا سزای دەدات، ئەم كاریگەریە لە كۆمەڵگەیەكەوە بۆ كۆمەڵگەیەكی دیكە جیاوازە.




## ٢- سەركردایەتی:

دەورێكی كاریگەری هەیە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە گشتییەكانی كۆمەڵگە گەرچی لەزۆربەی كۆمەڵ و كۆمەڵگاكاندا تاكە كەسێك زۆر دەسەڵاتی دەخرێتە ژێر دەستەوەو بەفەرمی دان بەوە دادەنرێت كە سەركردەیە، بەڵام فەرمانی سەركردایەتی میركارییانە یاخود نامیركارییانە بەسەر چەند ئەندامێكی كۆمەڵ و كۆمەڵگەدا دابەش دەبێت وەك سەردار یان گەورەی خێزان و سەركردەی قوتابخانەو كارگێڕی و ڕامیاری، سەركردە لەو بوارانەدا لە بوارەكانی دی لە ژیاندا دەورێكی كاریگەری دەبێت لە ڕووی ڕێكخستن و ڕەفتار كردنیان. وایان لێدەكات بڕوا بە ئامانج و مەبەستەكانیان بێنن و جاری واش هەیە دەتوانێت پەیوەندییەكان و داب و نەریتە كۆمەڵایەتییەكان و تەنانەت یاساكانی كۆمەڵگاش بگۆڕێت هەروەكو فەرماندەی ڕامیاریە.

## سەرکردایەتی گەلێك جۆرە دەتوانین دوو جۆریان جیابکەینەوە:-

**جۆری یەکەم:-** ئەو کەسانەن کە سیفەتەکانی سەرکردایەتییان تێدا نییە وەك لێهاتوویی و بەتوانایی‌و پێشکەوتوویی بیر و توانایی لە خەڵك گەیشتنی‌و لە خەڵك بگات پشتگیری کردنیان.

**جۆری دووەم:-** ئەو جۆرە سەرکردایەتییە کە لەسەر لێ هاتوویی بە توانایی سەرکردایەتی پلەو پایەکی دەدرێتی.

**ڕاهێنان**

بە وشەی گونجاو بۆشاییەکە پڕبکەوە:

سەرکردەی لێهاتوو وهاوچەرخ ئەو سەرکردەیە کە بە ________ دەگاتە پلەو پایەی دەسەلأت

**وشەکان**

١- بە زۆری هێز　　　　٢- بە هەڵبژاردن

**٣- یاسا:**

**بریتییە لە کۆمەڵێك دەستوور بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی کۆمەلأیەتی دەوڵەت دەیان پارێزن وا لەجەماوەر دەکات ڕێز لەیاسا بگرن.**

**گرنگی یاسا :**

١- یاسا مافی خەڵك دەسنیشاندەكات و كرداری نارەواو قەدەغەكراو دیاریدەكات تاكە كەس بێت یان كۆمەڵ.

٢- یاسا لە ڕێی داموو دەزگایەكانەوە دەسەڵاتی بەسەر خەڵك و كۆمەڵگە و دەزگاكاندا دەگرێت و یاساش بۆ ئەم مەبەستە دانراون وەك دادگاو پۆلیسو بەندیخانە.

٣- یاسا بە گوێرەی كۆمەڵگا مرۆڤییەكان (مەردوومییەكان) دەگۆڕێت بۆ نموونە: كۆمەڵگای سەرەتایی ـ یاسای نەریتی پەیڕەو دەكەن (القانون العرفی)، بەڵام كۆمەڵگای شارستانییەتی یاسا دانراو پەیڕەو دەكات.

## ٤- ئایین :

دەورێكی گرنگی هەیە لە دابینكاری كۆمەڵایەتیو وا لە خەڵك دەكات پابەندی بەهاو پێوەرە كۆمەڵایەتییەكانی نێو كۆمەڵگا بن و نابێ دەسەڵاتی خۆی بەسەر خەڵكدا بگرێتو پاكانییەكی هۆشمەندانە بۆ دەسەڵاتداری بكات. ئاین گەلێك فرمانی بنچینەیی هەیە لەنێو كۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ڕێزەكانی كۆمەڵ پتەو دەكاتو پشتگیری پەیڕەو و ڕەوشتی تاكە كەس بە پەیڕەوی دەكات وا لەخەڵك دەكات هەست بە ناسنامەی خۆیان بكەنو لەكاتی سەرگەردانیدا دڵیان دەداتەوەو سەبوورییان پێ دەبەخشێتو پاكانە بۆ زۆربەی كارەكانیشیان دەكات.

## ڕاهێنان

ئاینیە ئاسمانییەکان بۆ چاندنی گیانی تەبایی‌و برایی هاتوون:

کەواتە ئایین پەروەر ئەو کەسەیە کە

| | |
|---|---|
| گیانی لێبوردنی هەیە | دەمارگیرو توڕەیە |

## پرسیارەکان

١- بۆ مانەوەی کۆمەڵگە پێویستی بە چیی هەیە؟

٢- توخمەکانی دابینکاری کۆمەڵایەتی بژمێرە.

٣- ئەو هۆیانە بژمێرە کە کاردەکەنە سەر دابینکاری کۆمەڵایەتی بژمێرە.

٤- مانای سەرکردایەتی پێناسە بکە.

# کۆتایی

## ((وتەیەکی پێویست))

**مامۆستایانی بەڕێز..**

گۆڕینی پڕۆگرام تەکانێکە بۆ فریاکەوتنی گۆڕانکاری ژیان و بەرەوپێش چوونی کاروانی ڕووداوەکان..

لە سۆنگەی ئەم ڕاستیەی سەرەوە وەزارەتی پەروەردە لە هەوڵەکانی گۆڕینی پڕۆگرامی بابەتە کۆمەڵایەتیەکان بەردەوامە..

بەدەیان مامۆستا لە لە زانکۆکانی هەرێم، سەرباری شارەزا و سەرپەرشتیارە پسپۆڕەکان ماوەی ساڵێکە سەرقاڵی دانانی برگەو ناوەڕۆکی ئەم بابەتەن .. جگە لە چەندین سمینار و زنجیرەیەك کۆبونەوە.. ئامانجی ئەم گۆڕانکارییە چالاك کردنی ڕۆڵی قوتابی و کاریگەری زانیاریەکانە..

هیوادارین بە سەرنج و تێبینیەکانتان کەموکوڕی کتێبەکە و هەڵەکانی بۆ چاپی داهاتو ڕاست بکەنەوە.

بۆ وانەبێژی ئەم پەرتوکە تکامان وایە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەن:

یەکەم: هەموو هەفتەیەك هەرسێ بابەتەکە واتا جوگرافیا و مێژوو و هاونیشتمانیبوون دەخوێندرێت.

دووەم: لە ئەزموونەکانی مانگانە و نیوەی ساڵ و سەری ساڵ پرسیار لە هەرسێ بابەتەکە دێت نمرەکانیش بەم شێوەیە دابەش دەکرێت.

جوگرافیا ٤٠ نمرە، مێژوو ٤٠ نمرە، هاونیشتمانیبوون ٢٠نمرە

سێیەم: ڕاپۆرت ئامادەکردن و نووسینی پەخشی سەر دیوار بۆ سازدانی سمینار لایەنێکی گرنگی وانەبێژی هاوچەرخە، بۆیە ئەم لایەنە پێویستە بەپێی توانا بایەخی پێ بدرێت.

لەگەڵ هیوای سەرکەوتن

**لیژنەی ئامادەکار**